# فقه السنة

| کۆمەڵێك ڕوونکردنەوە دەربارەیی هەندێك بابەتی فقهـە |

کۆکردنەوە و نوسینی بەرهەمی کەناڵی:

| آثـار السلف |

# فقه السنة

| کۆمەڵێك ڕوونکردنەوە دەربارەیی هەندێك بابەتی فقهـه |

کۆکردنەوە و نوسینی بەرهەمی کەناڵی:

| آثار السلف |

# پــــێشــــەکـــــی



الحمد لله وكفى، والصلاة والسلام على نبيه المصطفى، وصحبه المجتبى أما بعد

بەیارمەتی و ئیزنی الله تعالى كورتە باسێك دەربارەیی چەند بابەتێك كە پەیووەستە بە بەژیانی هەریەك لە ئێمە، وە بابەتانێكن كە زۆورترین پرسیار دەربارەیی دەكرێتت، لە لایەن خوشك و برایانەوە، بۆیە بە یارمەتیی الله تعالى كۆمەڵێك بابەتمم كۆكردوەتەوە وە و نوسیوومەتەوە و لەم نامیلكەیە دەخرێتە بەردەستی خوێنەرانی هەموو موسڵمانێكی اهلی سوننە كە خەمخۆریی دینەكەیەتی و هەوڵی خۆفێركردن دەداتت و دەیەوێتت هەڵەكانی ڕاستت بكاتەوە، لە الله تعالى داوایی یارمەتی دەكەمم و الله تعالى یارمەتیدەربێتت كە حەقەكە بپێكین، ئەوەیی ڕاستت ووترابێتت ئەوە لە الله تعالى ـوەیەو ئەوەشی هەڵەبێتت لە نەفسی خۆم و شەیتانەوەیە.

أما بعد ...

## | بـــاس و بابەتێك دەربارەی ئـاوەكان |

ئەم بابەتە بووەتە پرسیارێكی ڕۆژانەی زۆرێك لە پیاوان و ئافرەتان:

### | پێنج ئاو لە ئینسان دێتە دەرەوە |

1. ئاوی مەنی
2. ئاوی مەذی
3. ئاوی وەدی
4. ئاوی ئیلتیهابات
5. ئاوی سەراو (سەراو تەقین كەلەكاتی حەملدا درووست دەبێت)

**1- مەنی :** ئیشتراكە لە نێوان پیاو و ئافرەت (هەم ئافرەت هەیەتی هەم پیاویش هەیەتی)
جۆری ئەم ئاوە لە پیاودا(مەنی پیاو) : سپیەكی خەستی تۆخە كەمێك لینجیشی تێدایە.
ئاوی ئافرەت(مەنی ئافرەت) : ڕوون و زەردی كاڵە و كەمێك لینجی لەگەڵدایە، ئەم ئاوە بۆنی ناخۆشە بۆنی هەویرێكی ترشاو عامی عولەما

ئەم جۆرە بۆنەیان بۆداناوە، كە باسیدەكەن و ووردی دەكەنەوە بۆنی شتێكی ناخۆش ترشاو هەویرێك لەو جۆرە بۆنانە.

**مەنی چ کاتێك دێت :** کاتێك کە جیماع ڕوویدات، بەومەرجەی پیاو ئافرەت بگەنە حاڵەتی کۆتای لە زمانی سەردەمدا پێی دەوترێت(ئۆرگازم)، لە زمانی شەرعدا لەو زاراوەی کە بۆی بەکار هاتووە پێی دەوترێت(ڕەحەت بوون)، هەرکاتێك پیاو گەیشتە حاڵەتی کۆتای لە جووت بوونەکەیدا کە پێی دەوترێت ڕەحت بوون ئەم

مەنیە دێتە دەرەوە، بە هەمان شێوە ئافرەت لە کاتی جیماعەکەیدا گەیشتە کۆتایی و حاڵەتی ڕەحەت بوون ئەم ئاوە دێتە دەرەوە،
ئەم ئاوە غوسل واجب دەکات لەسەر پیاو ـیش و لەسەر ئافرەت ـیش، بەڵام ئەم ئاوە گەر بەر جلەکانت بکەوێت پاکە، پێغەمبەر ـی الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ مەنیەکەی بەر پۆشاکەکەی دایکما خاتو عائیشە کەوت ـ رضي الله تعالى عنها ـ (پێی شەرمبوو کە واهی بچێتە دەرەوە) پێغەمبەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ پێی فەرموو : ئەی عائیشە ئەوە ئاوێکی پاکە تەنها بە دەستت لێی بکەرەوە، فەرمووی بە لەپی دەستت بی پڕووێنە، ئامۆژگاری دایکمان عائیشە ـی کرد ـ ضي الله عنهاـ کەوای لێبکات بۆ ئەوەی کە لێبێتەوە، فەرمووی بەهیچ جۆرێك مەیشۆ ئەو ئاوە پاکە، گەر بەر لاشەشت بکەوێت یان بەر پۆشاکەکەت بکەوێت بێ نوێژی ناکات ئاوێکی پاکە، تەنها ئەوەیە غوسلت لەسەر واجب دەکات.

**2- مەذی :** ئەمێش دووبارە موشتەرەکە لە نێوان پیاو و ئافرەت، ئاوێکی سپیی ڕوونە و لیق و لینجە، فەرقی نیە لە پیاو ئافرەتدا وەك یەکە شێوازەکەی، وە کەمێك بۆنیشی هەیە بەڵام بۆنەکەی ناخۆش نیە بە پێچەوانەی بۆنی مەنیەوە.

**لە چ کاتێکدا دێت :** لەکاتی شەهوەتدا دێت، چ جۆرە شەهوەتێك، بۆ نمونە دەس بازی، ماچکردن، نزیك بوونەوە لە خێزان، یاخود کردنی هەنێ قسە،

ئەمە زیاتر لە پێش جیماع ڕوودەدات(ئەو پێشەکیانەی پێش جیماع)، یاخود بەقسەکردن یەخود بیرکردنەوە لە مەشهەدێك لەحاڵێك هەرشێك لەوانە، یاخود چاوت دەچێتە سەر شتێک شتێك دەبینیت ختورەیەك بەمێشکتادێت یان بەدڵتادێت، هەست بە تەڕاییەك دەکەیت، بەڵام نەگەیشتویتەتە پلەی کۆتای چێژبینین (واتە نەگیشتویتەتە حاڵەتی ڕاحەت بوون) تەنها سەرەتای چێژەکەیە، وە مەذی زۆر زیاترە لەمەنی حاڵەتی ڕوودانەکەی بۆنمونە بەسەیرکردنێك دێتەخوارەوە ئەم ئاوە، ئەم ئاوە (واتە مەذی) خۆشتن واجب ناکات، بەڵکو بەر هەرشووێنێکی لاشەت کەوت لە عەورەتت یان ئەم لاو لای ڕانت یاخود بەر لیباسەکەت و پۆشاکی ژێرەوەت بکەوێت هەموو ئەوانە پیس دەکات و دەیشۆری، دەیگۆڕیت، وە دەست نوێژ واجب دەکات لەسەرت (واتە بەهاتنی مەذی دەست نوێژەکەت دەشکێ)

بەڵام ئەمە سرووشتی ئینسانە واتە زۆریی و کەمی وەك یەك نیە لە کەسەکانە واتە لە کەسێك زۆربوو لە کەسێکی کەش هەر هەمان حاڵەتبێت، هەمانە مەذی زۆرە هەمانە مەذی کەمە، ئەمە پێووەندی بە خودی کەسەکەوەیە هەنێك کەس زۆرە هەنێك کەمترە.

**3- وەدی :** ئەم ئاوەش لە پیاو وئافرەت ـدا موشتەرەکە، ئاوێکی سپی خەستە، لە دووای میز کردنەوە دێتە دەرەوە، لە شێوەی کڵۆدایە، لینجێکی خەستە، ئەم ئاوە بەر پۆشاکت ناکەوێت، چونکە لەکاتی تاراتدایی دەتوانی پاکی کەیتەوە، بەڵام هەندێ کەس بە پەلەو شپرز میزدەکات و تارات دەگرێت زوو هەڵەسێت و دێتە دەرەوە، ئەو وەدیەش هەنێ کات چەند چرکەیەك دووای میز دێت، هەندێ جاریش لەگەڵ میزەکەدا دێت، حاشاکوم حاشاکوم بابەتەکە وا هەڵدەگرێت کە واهی ڕوونکردنەوە بدرێت، بۆیە کاتێك کە ئینسان میزیکرد یەك دوو چرکە بمێنەرەوە بۆئەوەی کە وەدی ـەکە بێتە خوارەوەو ئەوجا تارات بگریت، چونکە جارهەیە پرسیاردەکرێت کە ئەوەنە زوو هاتۆتە دەرەوە لە لای مەخسەلەکە هەست

دەكات كە ئاوێكی پێدا دێتە خوارێ، دەڵێ ئایا مامۆستا حوكمی ئەو ئاوە چییە؟!
حوكمی ئەم ئاوە پیسە گەر بەر پۆشاكت بكەوێت دەبێت بیگۆڕیت، وە دەست نوێژی ـش دەشكێنێت.
ئەو سێ ئاوەی باسكرا لە نێوان پیاو ئافرەتدا موشتەرەكن.

## | ئەم ئاوانەی تر تایبەتن بە ئافرەتەوە تەنها |

**4- سەراو :** كیسە ئاوێكە لەگەڵ حەملا درووست دەبێت، ئەم ئاوە ئافرەتی واهەیە لە هەشت مانگیەوە یاخود لەسەرەتای مانگی نۆیەوە یاخود چەند ڕۆژێك پێش لەدایك بوون كونی تێدەبێت، ئەم ئافرەتە بەردەوام ئاوی لێ دێتە خوارەوە، حوكمی ئەم ئاوە پاكە وە دەست نوێژی ـش ناشكێنێت، بەڵام هەندێ ئافرەت هەیە كە سێ تا چوار ڕۆژ پێش منداڵ بوونەكەی سەراوی دەتەقێ، ئاوێكی بەخوڕ لە عەورەتی دێتە دەرەوە، ئەم ئاوە بەخوڕە كە دێتە دەرەوە ئەو ئاوە پاكە وە دەست نوێژی ـش ناشكێنێت.

**5- ئیلتهابات :** ئەو تەڕییە كە بەبەردەوامی لە ڕەحمی ئافرەتدا هەیە (حاشاكوم وەك ناو لوت وایە كە بە بەردەوامی تەڕە ئەویش ئاواهییە) وە ئاوەكەش لینجە هەندێ جار قاوەییە، لە كەسێك بۆ كەسێكی كە دەگۆڕێت، هەندێجار زەردە، هەندێجار كاڵ كاڵە، ئەمە لە سرووشتی ئافرەتێك بۆ ئافرەتێكی كە دەگۆڕێت، (لەسەر ئەم ڕووی زەوییە ئافرەتمان نیە ناو ڕەحمی تەڕنەبێت) بەڵام جیاوازیەكە لە یەك شتایە، ئافرەتمان هەیە تەڕییەكە لە ڕەحمیایەتی دایناباتە خوارەوە بۆسەر پۆشاكەكانی ژێرەوەی كە زۆر هەستی پێ بكات، بەڵام ئافرەتی وامان هەیە ڕاستەوخۆ پێیدا دێتە خوارەوە، جار هەیە ئافرەتەكە بەهیلاكدا دەبات، حوكمی ئەم
ئاوە(ئیلتیهابە) لە شەرعی ئێمەدا چییە، ئەم باس و بابەتە خیلافاتێكی زۆر زۆر زۆری لەسەرە لە لایەن زانایانەوە، بەڵام ئەوەی كە پێی گەیشتون عامەتی عولەما لە كیباری عولەما فتوا بەوە دەدەن كە ئەو ئاوە ئاوێكی پاكەو دەست نوێژ ناشكێنێت هەرچەندە زۆربێت، بەڵام بۆ ئیحطیاتی خۆت

ئەگەر پێت خۆشبوو وە لەماڵەوەبوویت زانیت پۆشاکەکانی ژێرەوەت زۆر زۆر تەڕە دەتوانی بیگۆڕیت و بەو پۆشاکەوە نوێژ نەکەیت بۆ دڵ موتمەئینی خۆت، دەنا پاکەو دەست نوێژی ـش ناشکێنێت، چونکە تۆ هەندێ جار لە ناو نوێژەکەیت تەڕایت پێدادێتە خوارێ ناکرێ نوێژەکەت ببڕی، بۆیە ڕای ئەسەح ئەوەیە ئەم ئاوە پاکە وە دەست نوێژی ـش ناشکێنێت، بەڵام لە بەرامبەردا حەدیث ێکمان هەیە کە دەفەرموویێت :(هەر شتێك لە پاش و پێشی ئینسان دەربچێت پیسەو دەست نوێژ دەشکێنێت) بەڵێ ئەمە حەدیث ـەو ڕاستە، بەڵام ئەم حەدیث ـە شەرحی بۆکراوە، هەموو شتێك کە دەربچێت[سَبِيلَين] دەرچەیە، ئێمە چەند دەرچەمان هەیە، بەشێوەیەکی عام سێ دەرچەی هەیە، دەرچەی(دەم، کۆم، عەورەت)، ئەم حەدیث ـە باسی دەرچەی دەم ناکات، [من سبيلين] باسی دەرچەی خوارەوە کۆم و عەورەت دەکات، هەرشتێك لەودووانە دەرچێت بێتە دەرەوە، دەست نوێژ دەشکێنێت، ئەم قەولە صحیحە، بەڵام شەرحی بۆکراوە و وە هەمووشتێ کە لە سبيلين بێتە دەرەوە دەست نوێژ بشکێنێت ئێللا نەصی شەرعیمان هەیە لەسەری جا ئایەت بێت یاخود حەدیث بێت، بۆنمونە میز و پیسایی، میز دەلیلمان هەیە لەسەری کە پیسە، کە بە عەورەتی ئینساندا بێتە خوارەوە دەست نوێژەکەی دەشکێنێت، دەلیلەکەش حەدیث ـی ئەعرابیەکەیە کە لەناو مزگەوتەکەی پێغەمبەری الله ـدا ـ صلى الله عليه وسلم ـ عەورەتی دەرهێناو میزیکرد، هەموو صەحابەکان توڕەبوون دەنگیان بەرزەوەکرد کە چۆن شتی وادەکەیت لەناو مزگەوتی پێغەمبەری الله ـدا ـ صلى الله عليه وسلم ـ ؟!

پێغەمبەری الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ پێی فەرموون : وازی لێبێنن میزەکەی پێ مەبڕن، بەڵکو کە تەواوبوو سەتڵێك ئاوبکەن بەسەر میزەکەیاو با ئەوکەسە دووای دەست نوێژ بگرێتەوە، کەواتە میز کە لە پێشەوەی ئینسان دێتەدەرەوە پیسە و بەر پۆشاك بکەوێت لەنوێژی دەبات وە دەست نوێژیش دەشکێنێت،

دووەم شت کە دێیتە دەرەوە لە دەرچەی دوواوەی ئینسان [غائيطه] پیساییە، وە حەدیث ـمان هەیە لەسەری کە پیسای کە دەست نوێژ

دەشكێنێت و بەر پۆشاك بكەوێت لە نوێژی دەبات(واتە بێ نوێژی دەكات)،

سێیەم شت كە لە دەرچەی ئینسانەوە دێتە دەرەوە (خوێنی حیض، خوێنی نیفاس) كە دەلیلمان هەیە لەسەری كەپیسەو دەست نوێژ دەشكێنن و غوسل واجب دەكەن لەسەرت،

وە (خوێنی نەخۆشی) ـیش لە دەرچەی ئینسان دێتەوەدەرەوە، بەڵام خوێنی نەخۆشی دەلیلمان هەیە لەسەری كەپاكە،

وە(مەنی) لەعەورەتی ئینسان دەێتەدەرەوە، پاكە بەڵام غوسل واجب دەكات، وە (مەذی) ـیش دێتە دەرەوە، بەڵام دەست نوێژ دەشكێنێت، وە (وەدی) هەموو ئەوانە كە لە [سبیلین] هاتنە دەرەوە، لە دوواوە و لەپێشەوە هەمووی بە نصوصی شەرعی حەرام بوو، هەمووی بە نصوصی شەرعی بۆمان هاتووە كەئەمە دەست نوێژ دەشكێنن یاخود غوسل واجب دەكەن، تاكە شتێك كە دەلیلی لەسەرنەبێت لەسەر پیسیەتیەكەی ئەو ئاو ئیفزازات و تەڕای و ڕتوباتەیە كە لە ڕەحمی ئافرەتدا هەیە، كەواتە هەرشتێك دەلیل لەسەر پیسیەتیەكەی نەبێت ئێمە قاعیدەی أصول فقهمان هەیە ئەمە قاعیدەیە، هەموو شتێك تۆ دەیبینیت لەسەر ئەم زەوویە ئەصلەكەی حەڵاڵەو پاكیشە، ئیللا مەگەر شتێك دەلیل هەبێت لەسەر كە ئەم شتە پیسە وە ئەم شتە حەڕامە، كەواتە بەبێ دەلیل ناتوانین هیچ شتێك پیس بكەین، وە بەبێ دەلیل ناتوانین هیچ شتێك حەڕام بكەین ئیللا دەبێت دەلیل هەبێت،
لەسەر هەموو ئەوشتانەی كە لە سبیل ـەینەوە دەرچو، كەواتە ئاوی ئافرەت ئیلتهاب كە لە ڕەحمیایەتی لەبەر ئەوەی هیچ نەصێكمان نیە لەسەری كە پیسی بكات كەواتە دەگەڕێینەوە بۆ ئەسڵیەكەی بۆ قاعیدە أصول فقهیەكەمان كە [الإباح والطهارە] لێرەدا پێوویستمان بە وشەی [طهار] ـەكە دەبێت، كەواتە ئەصحی ئەقوال ئەوەیە كە ئیتیهابات هەرچەندە

زۆربێت، پۆشاکی ژێرەوەشت تەڕبکات، نەدەست نوێژ دەشکێنێ نە پۆشاکەکەی ژێرەوەشت پیس دەکات.
بۆنمونە دەست نوێژتگرتوە بۆ نیوەڕۆ و نوێژی نیوەڕۆ دەکەیت لە نێوان نیوەڕۆ بۆ عەسر ئیلتیهاباتێکی زۆرت لێ دێتە خوارەوە، لە ماڵیشەوەی،

مەجالی دەست نوێژیشت هەیە، مەجالی جل گۆڕینیشت هەیە، بەڵام هیچیان ناکەیت، تەبیعی نوێژی عەسرەکەشتی پێووەدەکەیت، ئەم نوێژە قەبووڵە یان قەبووڵنیە؟ بەڵێ قەبووڵە، چونکە هیچ دەلیلێکمان نیە لەسەر پیسیەتی تەڕای ڕەحمی ئافرەت، ئەی ئەگەر لە دەرەوەبوویت، ئەوە ئەولاترە کە درووستە بۆت، بەڵام ئەگەر حەزتکرد وات پێخۆشبوو دەست نوێژ تازەکەیتەوە دەبێتە هۆی هەڵوەرینی تاوانت وەبەپاکی بچیتە ناو نوێژەکەت کە ئەمانە هەمووی ئەجرووپاداشتن بۆت، بەڵام بڕۆیت دینداریەتی پێوەبکەیت و بڵێی دەست نوێژەکەم شکا،هیچ دەلیلێکی صحیح و صەریحمان نیە لەسەری.
ئەم ئیلتهاباتە کە ئێمە دەڵێین تایبەتە بە ئافرەت، بەڵام هەندێ لە پیاوانیش ئیلتیهاباتیان هەیە، بەڵام بەڕێژەی ئافرەت نیە، ئیلتهاباتی پیاو ئەوەی نیە دابداتە

سەر پۆشاکەکانی ژێرەوەی و هەستی پێ بکات، بەڵکو لەناو بۆری زەکەری دەمێنێتەوە، وە لەکاتی جیماعدا ئەگەر مەنیەکەی داغڵ بەڕەحمی ئافرەتەکە بکات ئەو ئیلتهابەش داغڵ بەڕەحمی ئافرەتەکە دەبێت، جا ئیلتهاباتی پیاو بۆنێکی زیاتری هەیە، ئەم ئیلتهاباتە چونکە دایناداتە سەر پۆشکەکەی پیاوان هەستی پێناکەن، بەڵام دەی گواسێتەوە بۆ ئافرەتەکە و ئافرەتەکە توشی خورانێکی زۆر و بۆنێکی ناخۆشی ناوڕەحمی دەکات کە سەرئەنجام هۆکارەکە ئیلتهاباتی پیاوەکەیە،بۆیە دەبێت پیاو بڕوات عیلاج وەربگرێت

تێبینی // ئەم باس و بابەتەم وەرگرتووە لە بەژداریکردنم لە چەند وانەیەك و نوسیوومەتەوە، ئەوەی ڕاست بێتت لە الله ـوەیە و ئەوەشی هەڵەبێت لە

شەیتانی نەفرین لێکرا و نەفسی خۆمەوەیە، الله تعالی بەرچاوو ڕوونمانبکات لێمان خۆشبێت امین.

# دەروازەیی یـــــەکــــەم

## | دەروازەیەك دەربارەی مەنی و مەذی و وەدی |

ابن أبي شيبة لە مصنفەکەی بابێکی داناوە لەسەر ئەم بابەتە بەناوی [(١٠٨) في المني والمذي والودي]

واتە: دەربارەی مەنی و مەذی و وەدی :

علي کوڕی أبو طالب ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ ـ دەڵێت : من مەزیم زۆر بوو بە میقدادم ووت کە پرسیار لە پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ بکات دەربارەی، چونکە کچەکەی لای منە(واتە خێزانمە مەبەست فاطمەیە) شەرمم دەکرد کە ئەو پرسیارەی لێ بکەم، پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرمووی : هەموو نێرێك مەذی دەردەکات ئەگەر هاتوو مەنی لێ دەرچوو ئەوە غوسلی لەسەرە، وە ئەگەر هاتوو مەذی لێ دەرچوو ئەوە دەستنوێژی لەسەرە .

٩٧٢- حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنِ الْحَسَنِ، عَنْ عَلِيٍّ، قَالَ:
كُنْتُ أَجِدُ مَذْيًا فَأَمَرْتُ الْمِقْدَادَ أَنْ يَسْأَلَ النَّبِيَّ صَلَّى الله عَلَيه وسَلَّم عَنْ ذَلِكَ، لأَنَّ ابْنَتَهُ عِنْدِي فَاسْتَحْيَيْتُ أَنْ أَسْأَلَهُ، فَسَأَلَهُ، فَقَالَ:
إنَّ كُلَّ فَحْلٍ يُمْذِي فَإِذَا كَانَ الْمَنِيُّ فَفِيهِ الْغُسْلُ، وَإِذَا كَانَ الْمَذْيُ فَفِيهِ الْوُضُوءُ.

ابن عباس ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما ـ دەفەرموێت : مەنی غوسلی لەسەرە، وە مەذی دامێنت دەشۆیت و دەستنوێژ دەگریت، وە ئەوەی لە شەهوەتەوەیە نازانم چیە؟

٩٧٨- حَدَّثَنَا ابْنُ عُلَيَّةَ، عَنِ ابْنِ عَوْنٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ سِيرِينَ، قَالَ:
قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: الْمَنِيُّ يُغْتَسَلُ مِنْهُ، وَالْمَذْيُ يَغْسِلُ مِنْهُ فَرْجَهُ وَيَتَوَضَّأُ، وَالْذي مِنَ الشَّهْوَةِ لاَ أَدْرِي مَا هُوَ؟

دایکە عائیشە ـ رَضِيَ اللهُ عَنْها ـ دەفەرموێت : مەنی غوسلی لەسەرە، وە مەذی و وەدی دەستنوێژ دەگریتەوە لێیان .

٩٨٢- حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ عِكْرِمَةَ بْنِ عَمَّارٍ، عَنْ عَبْدِ رَبِّهِ بْنِ مُوسَى، عَنْ أُمِّهِ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتِ: الْمَنِيُّ مِنْهُ الْغُسْلُ، وَالْمَذْيُ وَالْوَدْيُ يُتَوَضَّأُ مِنْهُمَا.

عِكْرِمَةَ ـ رحمه الله ـ دەڵێت : مەنی و وەدی و مەذی، مەنی غوسلی لەسەرە، بەڵام مەذی و وەدی زەکەرت دەشۆیت و دەستنوێژ دەگریت .

٩٨٥- حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ جَعْفَرِ بْنِ بُرْقَانَ وَعُمَرَ بْنِ الْوَلِيدِ الشَّنِّيِّ، عَنْ عِكْرِمَةَ، قَالَ: الْمَنِيُّ وَالْوَدْيُ وَالْمَذْيُ، فَأَمَّا الْمَنِيُّ فَفِيهِ الْغُسْلُ، وَأَمَّا الْمَذْيُ وَالْوَدْيُ فَيَغْسِلُ ذَكَرَهُ وَيَتَوَضَّأُ.

سِمَاكٍ دەڵێت : وتم بە حەسەنی بەصری : ئەبینی پیاوێك كاتێك مەذی هات چی بكات؟
ووتی : هەموو نێرێك مەذی دەردەكات، ئەگەر هاتوو ئەوەی بەسەر هات زەكەری دەشوات .

٩٨٦- حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنْ سِمَاكٍ، قَالَ: قُلْتُ لِلْحَسَنِ الْبَصْرِيِّ: أَرَأَيْت الرَّجُلَ إذَا أَمْذَى كَيْفَ يَصْنَعُ؟ فَقَالَ: كُلُّ فَحْلٍ يُمْذِي، فَإِذَا كَانَ ذَلِكَ فَلْيَغْسِلْ ذَكَرَهُ.

ئیمام مُجَاهِدٍ دەڵێت : مەنی و وەدی و مەذی، بۆ مەنی غوسلی لەسەرە، وە وەدی و مەذی دەستنوێژی لەسەرە .

٩٨٧- حَدَّثَنَا ابْنُ فُضَيْلٍ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ مُجَاهِدٍ، قَالَ:
الْمَنِيُّ وَالْوَدْيُ وَالْمَذْيُ، فَفِي الْمَنِيِّ الْغُسْلُ، وَالْوَدْيِ وَالْمَذْيِ الْوُضُوءُ.

سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ دەربارەی مەذی دەڵێت : زەکەرت سێ جار دەشۆیت و دەستنوێژ دەگریت .

٩٨٨- حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ زِيَادِ بْنِ فَيَّاضٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ؛ أَنَّهُ قَالَ فِي الْمَذْيِ: يَغْسِلُ الْحَشَفَةَ ثَلاَثًا، وَيَتَوَضَّأُ.

ابن عباس ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما ـ دەڵێت : مەنی و وەدی و مەذی، بۆ مەنی غوسلی لەسەرە، بەڵام مەذی و وەدی دەستنوێژیان لەسەرە، وە شۆردنی زەکەری .

٩٨٩- حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، قَالَ: حدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: الْمَنِيُّ وَالْوَدْيُ وَالْمَذْيُ، فَأَمَّا الْمَنِيُّ فَفِيهِ الْغُسْلُ، وَأَمَّا الْمَذْيُ وَالْوَدْيُ فَفِيهِمَا الْوُضُوءُ، وَيَغْسِلُ ذَكَرَهُ.

**[مصنف ابن أبي شيبة]**

تێبینی: مەنی پاکە بەڵام کە هاتەوە غوسل واجب دەکات و دەبێت غوسل بکەیت ، بەڵام مەذی و وەدی پاك نین و پیسن کە هاتەوە تەنها زەکەرت دەشۆیت و دەستنوێژ دەگریت وە غوسلت لەسەر نیە، والله اعلم .

# دەروازەیی دووەم

## | ئافرەتێك تووشی جەنابەت دەبێت پێش ئەوەی غوسل بکات تووشی حیض یش دەبێت، ئایە غوسلی جەنابەت دەر بکات یان چاوەڕێی تەواو بوونی حیض ـەکەی بکات و پاشان غوسل بکات؟ |

ابن أبي شيبة لە مصنف بابێکی لەسەر ئەم بابەتە داناوەو وەڵامەکەی لێوە وەردەگرین إِنْ شَاءَ الله :[(٩٧) في المراة تجنب ثم تحيض]

واتە: دەربارەی ئافرەتێك تووشی جەنابەت دەبێت پاشات حەیضی بەسەردێت :

إبراهيم النخعي لە بارەی ئافرەتێك تووشی جەنابەت دەبێت پاشان حەیضی بەسەردێت دەڵێت : غوسل دەکات (واتە غوسلی جەنابەت دەردەکان).

٨٤٣- حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنْ مُغِيرَةَ، عَنْ إبْرَاهِيمَ فِي الْمَرْأَةِ تَجْنُبُ، ثُمَّ تَحِيضُ، قَالَ: تَغْتَسِلُ.

عطاء دەڵێت : حەیض توندترە لە جەنابەت .

٨٤٤- حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنِ الْعَلاَءِ، عَنْ عَطَاءٍ، قَالَ: الْحَيْضُ أَشَدُّ مِنَ الْجَنَابَةِ.

حەسەن بەصری لەبارەی پیاوێك دەچێتە لای خێزانەکەی، پاشان خێزانەکەی حەیضی تووشی حەیض دەبێت پێش ئەوەی غوسل بکات، دەڵێت : ئەنەسی کوڕی مالیك ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُـ پێی خۆش بوو کە غوسل بکات .

٨٤٥- حَدَّثَنَا ابْنُ عُلَيَّةَ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ الْحَسَنِ؛ أَنَّهُ قَالَ؛ فِي الرَّجُلِ يُصِيبُ امْرَأَتَهُ، ثُمَّ تَحِيضُ قَبْلَ أَنْ تَغْتَسِلَ، قَالَ: كَانَ أَنَسٌ يُحِبُّ لَهَا أَنْ تَغْتَسِلَ.

زوهری لە بارەی پیاوێك تێکەڵی خێزانەکەی دەبێت(واتە کاری جیماع دەکات)، خێزانەکەی تووشی حەیض دەبێت پێش ئەوەی کە غوسل بکات، دەڵێت : غوسل دەکات .

٨٤٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ؛ فِي رَجُلٍ وَقَعَ بِامْرَأَتِهِ؛ فَحَاضَتْ قَبْلَ أَنْ تَغْتَسِلَ، قَالَ: تَغْتَسِلُ.

شوعبە دەڵێت : پرسیم لە حەکەم و حەماد دەربارەی ئافرەتێك تووشی جەنابەت دەبێت پاشان حەیضی بەسەردادێت؟
ووتیان : غوسل دەردەکان .

٨٤٧- حَدَّثَنَا حَرَمِيُّ بْنُ عُمَارَةَ، عَنْ شُعْبَةَ، قَالَ: سَأَلْتُ الْحَكَمَ، وَحَمَّادًا عَنِ الْمَرْأَةِ تجنب، ثُمَّ تَحِيضُ؟ قَالاَ: تَغْتَسِلُ.

قەتادە دەڵێت : غوسل دەکات .

٨٤٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ قَتَادَةَ، قَالَ: تَغْتَسِلُ.

إبراهيم النخعي دەڵێت : غوسل دەکات، پاشان ماوەی حەیضەکەی تەواو دەکات .

٨٤٩- حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ عَيَّاشٍ، عَنْ مُغِيرَةَ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: تَغْتَسِلُ، ثُمَّ تَمْكُثُ حَائِضًا.

عطاء دەڵێت : غوسلی لەسەر نیە، دەڵێت وە حەماد لە إبراهيم دەڵێت : غوسلی لەسەرە .

٨٥٠- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ غِيَاثٍ، عَنِ الْعَلاَءِ، عَنْ عَطَاءٍ، قَالَ: لَيْسَ عَلَيْهَا الْغُسْلُ، قَالَ: وَقَالَ حَمَّادٌ، عَنْ إبْرَاهِيمَ: عَلَيْهَا الْغُسْلُ.

عَمْرِو بْنِ هَرِمٍ دەڵێت : پرسیم لە جابری کوڕی زەید دەربارەی ئافرەتێك تووشی جەنابەت دەبێت، پاشان حەیضی بەسەردادێت پێش ئەوەی کە غوسل بکات؟ وە ئەگەر حەیض یشی هەبوو، ئەوە حەقە لەسەری کە غوسل بکات (واتە غوسلی جەنابەت).

٨٥١- حَدَّثَنَا يَزِيدُ، عَنْ حَبِيبٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ هَرِمٍ، قَالَ: سُئِلَ جَابِرُ بْنُ زَيْدٍ عَنِ الْمَرْأَةِ تُجنبُ، ثُمَّ تَحِيضُ قَبْلَ أَنْ تَغْتَسِلَ؟ قَالَ: وَإِنْ حَاضَتْ، فَإِنَّهُ حَقٌّ عَلَيْهَا أَنْ تَغْتَسِلَ.

عامِر دەڵێت : ئەگەر ویستی غوسل دەکات، وە ئەگەر نەیویست غوسل ناکات .

٨٥٢- حَدَّثَنَا إسْمَاعِيلُ بْنُ عَيَّاشٍ، عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ، عَنْ عَامِرٍ، قَالَ: إنْ شَاءَتِ اغْتَسَلَتْ، وَإِنْ شَاءَتْ لَمْ تَغْتَسِلْ.

عطاء دەڵێت : غوسل دەکات لە جەنابەت، کاتێك پاك بوویەوە غوسل دەکات لە حەیضەکەی .

٨٥٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّد بن مُيَسَّر، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنْ عَطَاءٍ، قَالَ: تَغْتَسِلُ مِنَ الْجَنَابَةِ، فَإِذَا طَهُرَتِ اغْتَسَلَتْ مِنَ الْحَيْضِ.

[مصنف ابن أبي شيبة]

// تێبینی : بابەتێکی فقهیەو ئاساییە جیاوازی هەبێت، ئەو ئافرەتانەی وایان بەسەردا دێت غوسلی جەنابەت بکەن و دواتر ماوەی حەیض تەواو بوو پاك بوونەوە غوسلی خۆتان بکەن ئاوا باشترە بۆتان ، والله اعلم .

## دەروازەیی ســێــیــەم

**| کەسێك لە مانگی ڕەمەزان شەو تووشی جەنابەت بووە، یان جیماعی کردووە لەگەڵ خێزانی پاشان خۆی ناشوات و غوسل ناکات هەتا ڕۆژ دەبێتەوە و دوای بانگی بەیانیە، ئایا دەتوانێ بە ڕۆژوو بێت؟ |**

یان کەسێك خەوتووەو سبەی هەڵدەستێ تووشی جەنابەت بووە ئایا ڕۆژووەکەی دەشکێت یان بەردەوام بێت و کێشەی نیە؟

وەڵام : دەتوانێ دوای بانگی بەیانی خۆی بشوات و بەردەوام بێت لەسەر ڕۆژووەکەی و هیچ کێشەی نیە بۆی .

وە کەسێکیش خەوتبێ و کاتێك هەڵدەستێ تووشی جەنابەت بووە هیچ کێشەیەك لەسەر ڕۆژووەکەی دروست ناکات و بەردەوام دەبێت لەسەر ڕۆژووەکەی .

ابن أبي شيبة لە مصنف ـەکەیدا بابێکی داناوە لەسەر ئەم بابەتە بەناوی : [(٧٨) في الرجل يصبح وهو جنب يغتسل، ويجزيه صومه]

واتە: لەبارەی پیاوێك ڕۆژ دەکاتەوەو لە جەنابەتدایە غوسل دەکات ، وە بەردەوام دەبێت لەسەر ڕۆژووەکەی و دروستە .

٩٦٥٩- حَدَّثَنَا ابْنُ فُضَيْلٍ، عَنْ مُطَرِّفٍ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى الله عَلَيه وسَلَّم يَبِيتُ جُنُبًا، فَيَأْتِيهِ بِلاَلٌ فَيُؤْذِنُهُ بِالصَّلاَةِ، فَيَقُومُ فَيَغْتَسِلُ، فَأَنْظُرُ إِلَى تَحَدُّرِ الْمَاءِ مِنْ رَأْسِهِ، ثُمَّ يَخْرُجُ فَأَسْمَعُ صَوْتَهُ فِي صَلاَةِ الْفَجْرِ، ثُمَّ يَظَلُّ صَائِمًا، قَالَ مُطَرِّفٌ: فَقُلْتُ لِعَامِرٍ: فِي رَمَضَانَ؟ قَالَ: نَعَمْ، سَوَاءٌ رَمَضَانُ وَغَيْرُهُ.

دایکه عَائِشَةَ ـ رَضِيَ اللهُ عَنْها ـ دەفەرمویێت : پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ شەو بە لەشگرانی دەمایەوە، جا بیلال دەهات بۆ ئەوەی ئاگاداری بکاتەوە کە کاتی نوێژ هاتووە، ئینجا ئەویش هەڵدەستاو خۆی دەشۆرد، من سەیری ئەو دڵۆپە ئاوانەم دەکرد کە لە قژی دەهاتە خوارەوە، پاشان دەڕۆیشت(بۆ مزگەوت) و منیش گوێم لە دەنگی دەبوو لە نوێژی بەیانیدا، پاشان ڕۆژ دەبوویەوە بە ڕۆژوو بوو،

مُطَرِّفٍ دەڵێت : ووتم بە عامیر(الشَّعْبِيّ) ئەوە لە ڕەمەزاندا بوو؟
ووتی : بەڵێ، لە ڕەمەزان و غەیری ئەوەشدا وەك یەکە .

٩٦٦٠ـ حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ عُمَارَةَ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ هِشَامٍ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى الله عَلَيه وسَلَّم يُصْبِحُ جُنُبًا، ثُمَّ يَغْتَسِلُ، ثُمَّ يُتِمُّ صَوْمَهُ.

دایکه عَائِشَةَ ـ رَضِيَ اللهُ عَنْها ـ دەفەرمویێت : پێغەمبەری الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ ڕۆژی دەکردەوەو لەشی گران بوو، پاشان خۆی دەشۆرد، پاشان ڕۆژووەکەی تەواو دەکرد .

٩٦٦١ـ حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ مُسْهِرٍ، عَنِ الشَّيْبَانِيِّ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى الله عَلَيه وسَلَّم يُصْبِحُ جُنُبًا، ثُمَّ يَغْتَسِلُ فَيَخْرُجُ مِنْ مُغْتَسَلِهِ، فَيُصَلِّي بِالنَّاسِ، وَيَصُومُ ذَلِكَ الْيَوْمَ.

دایکه عَائِشَةَ ـ رَضِيَ اللهُ عَنْها ـ دەفەرمویێت : پێغەمبەری الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ ڕۆژی دەکردەوەو لەشی گران بوو، پاشان خۆی دەشۆرد و دەردەچوو لە شوێنی خۆشۆردنەکەی(ئەچو بۆ مزگەوت)، نوێژی بۆ خەڵکی دەکرد، وە هەمان ڕۆژیش بە ڕۆژوو دەبوو .

٩٦٦٢ـ حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى الله عَلَيه وسَلَّم يُصْبِحُ جُنُبًا مِنْ غَيْرِ احْتِلاَمٍ، ثُمَّ يَغْتَسِلُ وَيَمْضِي عَلَى صَوْمِهِ.

<u>دایکی ئیمانداران أُمِّ سَلَمَةَ ـ رَضِيَ اللهُ عَنْها ـ دەفەرمویێت :</u> پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ ڕۆژی دەکردەوە لەشی گران بوو لە غەیری لەشگرانی ئاسایی کە لە خەو تووشی بێت(واتە شەو جیماعی کردووە)، پاشان خۆی دەشۆرد و بەردەوام دەبوو لەسەر ڕۆژووەکەی .

٩٦٦٤ـ حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ جَامِعِ بْنِ شَدَّادٍ، عَنِ الأَسْوَدِ بْنِ هِلاَلٍ، قَالَ: جَاءَ عَبْدُ اللهِ بْنُ مِرْدَاسٍ إِلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، فَقَالَ: إِنِّي أَصْبَحْتُ وَأَنَا جُنُبٌ، فَأُتِمُّ صَوْمِي؟ قَالَ عَبْدُ اللهِ: أَصْبَحْتَ فَحَلَّ لَكَ الصَّلاَةُ، وَحَلَّ لَكَ الصِّيَامُ، اغْتَسِلْ وَأَتِمَّ صَوْمَكَ.

<u>الأَسْوَدِ بْنِ هِلاَلٍ دەڵێت :</u> عبْدُ اللهِ بْنُ مِرْدَاسٍ هات بۆ لای عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ ـ ، پێی ووت : من ڕۆژ دەکەمەوەو لەشم گرانە، ڕۆژووەکەم تەواو بکەم؟
عبدالله فەرمووی : ڕۆژت کردەوە نوێژکردنت بۆ حەڵاڵ دەبێت، وە ڕۆژووگرتنت بۆ حەڵاڵ دەبێت، خۆت بشۆو ڕۆژووەکەت تەواو بکە .

٩٦٦٥ـ حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ عُمَارَةَ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ أَبِي عَطِيَّةَ الْوَادِعِيِّ، قَالَ: تَدَارَأَ رَجُلاَنِ فِي الْمَسْجِدِ فِي رَجُلٍ يُصْبِحُ وَهُوَ جُنُبٌ، فَانْطَلَقَا إِلَى عَبْدِ اللهِ، فَانْطَلَقْتُ مَعَهُمَا، فَسَأَلَهُ أَحَدُهُمَا فَقَالَ: أَيَصُومُ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَإِنْ كَانَ مِنَ النِّسَاءِ؟ قَالَ: وَإِنْ كَانَ مِنَ النِّسَاءِ، قَالَ: وَإِنْ نَامَ مُتَعَمِّدًا؟ قَالَ: وَإِنْ نَامَ مُتَعَمِّدًا.

<u>أَبِي عَطِيَّةَ الْوَادِعِيِّ دەڵێت :</u> دوو پیاو مشتومڕیان دەکرد لە مزگەوت لە بارەی پیاوێك ڕۆژ بکاتەوەو لەشی گران بێت، چوون بۆ لای عبدالله بن مسعود ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ ـ ، منیش لەگەڵیان ڕۆشتم، یەکیان پرسیاری لێ کردو پێی ووت : ئایا بە ڕۆژوو دەبێت(ئەوەی ڕۆژ ئەکاتەوەو لەشی گرانە)؟
ابن مسعود فەرمووی : بەڵێ،
ووتی : ئەگەر لە ژنەکەشی تووشی لەشگرانی بووبێ؟

فەرمووی : ئەگەر لە ژنەکەشی بێت،
ووتی : ئەی ئەگەر بە عەمدەن خەوتبێ ؟ فەرمووی : ئەگەر بە عەمدەنیش خەوتبێ .

٩٦٦٧- حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الْحَارِثِ، عَنْ عَلِيٍّ، قَالَ: إِذَا أَصْبَحَ الرَّجُلُ وَهُوَ جُنُبٌ فَأَرَادَ أَنْ يَصُومَ، فَلْيَصُمْ إِنْ شَاءَ.

علي بن أبي طالب ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ ـ دەفەرموێت : ئەگەر پیاوێك ڕۆژی كردەوەو لەشی گران بوو دەیویست كە بە ڕۆژوو بێت، با بەڕۆژوو بێت ئەگەر ویستی .

٩٦٦٨- حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ، عَنْ عَمَّارٍ مَوْلَى بَنِي هَاشِمٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَزَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ؛ فِي الرَّجُلِ يُصْبِحُ وَهُوَ جُنُبٌ، قَالُوا: يَمْضِي عَلَى صَوْمِهِ.

أَبِي هُرَيْرَةَ، وَزَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، وَابْنِ عَبَّاسٍ ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُم ـ لە بارەی پیاوێك ڕۆژ دەكاتەوەو لەشی گرانە،
فەرموویان : بەردەوام دەبێت لەسەر ڕۆژووەكەی .

٩٦٦٩- حَدَّثَنَا أَسْبَاطُ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنِ التَّيْمِيِّ، عَنْ أَبِي مِجْلَزٍ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: قَالَ أَبُو ذَرٍّ: لَوْ أَصْبَحْت جُنُبًا مِنَ امْرَأَتِي لَصُمْتُ.

أَبُو ذَرٍّ ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ ـ دەفەرموێت : ئەگەر هاتوو ڕۆژت كردەوە و لەشت گران و لە هاوسەرەكەت(لە كاتی جیماع)، بە ڕۆژوو دەبی .

٩٦٧٠- حَدَّثَنَا شَبَابَةُ بْنُ سَوَّارٍ، عَنْ لَيْثِ بْنِ سَعْدٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ هِشَامٍ، قَالَ: أَخْبَرَتْنِي عَائِشَةُ، وَأُمُّ سَلَمَةَ؛ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى الله عَلَيه وسَلَّم كَانَ يُدْرِكُهُ الْفَجْرُ وَهُوَ جُنُبٌ مِنْ أَهْلِهِ، ثُمَّ يَغْتَسِلُ وَيَصُومُ.

عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ هِشَامٍ دەڵێ: عَائِشَةُ، و أُمُّ سَلَمَةَ ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما ـ هەواڵیان پێدام ، کە پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ دەگەشتە کاتی فەجر و لەشی گران بوو لە خێزانەکانی، پاشان خۆی دەشۆرد و بە ڕۆژوو دەبوو .

٩٦٧١ـ حَدَّثَنَا شَبَابَةُ، قَالَ: حدَّثَنَا هِشَامِ بْنُ الْغَازِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: لَوْ نَادَى الْمُنَادِي وَأَنَا بَيْنَ رِجْلَيْهَا لَقُمْتُ فَأَتْمَمْتُ الصِّيَامَ، صِيَامَ رَمَضَانَ كَانَ، أَوْ غَيْرَهُ.

ابْنِ عُمَر ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما ـ دەفەرموێت : ئەگەر بانگ بێژەکە بانگی داو من لە نێوان قاچەکانی خێزانەکەم بم(بۆ جیماع) هەڵدەستم و بەردەوام دەبم لەسەر ڕۆژووەکەم و تەواوی دەکەم ، ڕۆژووی ڕەمەزان بێت یان غەیری ئەوە .

٩٦٧٢ـ حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إبْرَاهِيمَ (ح) وَعَنْ رَبِيعٍ، عَنِ الْحَسَنِ، قَالَ: يُجْزِيهِ فِي التَّطَوُّعِ، وَيَقْضِيهِ فِي الْفَرِيضَةِ.

الْحَسَنِ البصري دەڵێت : دروستە لە ڕۆژووی سوننەت ، وە قەزای دەکاتەوە لە ڕۆژووی واجب .

٩٦٧٣ـ حَدَّثَنَا عَائِذُ بْنُ حَبِيبٍ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، قَالَ: عَلَيْهِ الْقَضَاءُ.

هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ دەڵێت : قەزا کردنەوەی لەسەرە .

٩٦٧٤ـ حَدَّثَنَا يَزِيدُ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنِ ابْنِ الْمُسَيَّبِ؛ أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ رَجَعَ عَنْ فُتْيَاهُ؛ مَنْ أَصْبَحَ جُنُبًا فَلاَ صَوْمَ لَهُ.

ابْنِ الْمُسَيَّبِ دەڵێت : أبو هريرة ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ ـ گەڕاوەتەوە لەو فتوایەی، کە وتویەتی هەر کەسێك ڕۆژ بکاتەوەو لەشی گران بێت ڕۆژووی بۆ نیە.

٩٦٧٥- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ أَبِي بُكَيْرٍ، قَالَ: حدَّثَنَا إبْرَاهِيمُ بْنُ نَافِعٍ، قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ طَاوُوسٍ يَذْكُرُ، عَنْ طَاوُوسٍ، قَالَ: إنْ أَصَابَتْهُ جَنَابَةٌ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ، فَإِنَ اسْتَيْقَظَ وَلَمْ يَغْتَسِلْ حَتَّى يُصْبِحَ، فَإِنَّهُ يُتِمُّ ذَلِكَ الْيَوْمَ وَيَصُومُ يَوْمًا مَكَانَهُ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَيْقِظْ فَلَيْسَ عَلَيْهِ بَدَلٌ.

طَاوُوسٍ دەڵێت : ئەگەرتووشی لەشگرانی بوویت لە مانگی ڕەمەزان، ئەگەر هەڵسایت و خۆت نەشۆرد هەتا ڕۆژ دەبێتەوە، ئەوە ئەو ڕۆژە تەواو دەکەیت و ڕۆژێك دەگریتەوە لە جێگای، وە ئەگەر هەڵنەستایت ئەوە ڕۆژوو گرتنەوەت لەسەر نیە .

٩٦٧٦- حَدَّثَنَا حَفْصٌ، عَنْ هِشَامٍ، وَأَشْعَثَ، عَنِ ابْنِ سِيرِينَ، قَالَ:
قَالَ عَبْدُ اللهِ: لَوْ أَذَّنَ الْمُؤَذِّنُ وَأَنَا بَيْنَ رِجْلَيِ امْرَأَتِي، لاَغْتَسَلْتُ ثُمَّ صُمْتُ.

عبدالله بن مسعود ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ ـ دەفەرموێت : ئەگەر هاتوو بانگ بێژ بانگ بدات و من لە نێوان قاچەکانی خێزانەکەم بم(بۆ جیماع)، خۆم دەشۆم و پاشان بەڕۆژوو دەبم .

٩٦٧٧- حَدَّثَنَا ابْنُ عُلَيَّةَ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ نَافِعٍ، قَالَ: قَالَ عُمَرُ: لَوْ أَدْرَكَنِي النِّدَاءُ وَأَنَا بَيْنَ رِجْلَيْهَا لَصُمْتُ، أَوَ قَالَ: مَا أَفْطَرْت.

ئیمامی عومەر ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ ـ دەفەرموێت : ئەگەر هاتوو گەشتم بە کاتی بانگ و من لە نێوان قاچەکانی خێزانەکەم بم، بە ڕۆژوو دەبم، یان فەرمووی : ڕۆژووەکەم ناشکێنم .

[مصنف ابن أبي شيبة]

قال ابنُ قدامة: الجنُب له أن يؤخِّرَ الغُسلَ حتى يُصبِحَ ثم يغتَسِل ويُتِم صَومَه في قولِ عامَّةِ أهل العلم؛ منهم علي وابن مسعود، وزيد وأبو الدرداء، وأبو ذر وابن عمر، وابن عباس وعائشة، وأم سلمة رَضِيَ اللهُ عنهم، وبه قال مالك والشَّافعي في أهل الحجاز، وأبو حنيفة والثوري في أهل العراق، والأوزاعي في أهل الشَّام، والليث في أهل مصر، وإسحاق وأبو عبيد في أهل الحديث، وداود في أهل الظاهر، وكان أبو هريرة يقول: لا صَومَ له، ويروي ذلك عن النبيِّ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم، ثم رجع عنه، قال سعيدُ بنُ المسيِّب: رجع أبو هريرة عن فُتْياه. وحكي عن الحسن وسالم بن عبد الله قالا: يُتِمُّ صَومَه ويقضي. وعن النَّخَعي في روايةٍ: يقضي في الفَرضِ دونَ التطوُّعِ. وعن عُروةَ وطاوس: إن عَلِمَ بجَنابَتِه في رمضانَ فلم يغتَسِلء حتى أصبَحَ، فهو مُفطِرٌ، وإن لم يعلَمْ فهو صائمٌ .

<u>ابن قدامة دەڵێت :</u> لەشگران بۆی هەیە کە غوسل دوا بخات هەتا ڕۆژ دەبێتەوە پاشان خۆی بشوات و ڕۆژووەکەی تەواو بکات، لە ووتەی زۆرینەی ئەهلی عیلمدا، لەوانە (علي و ابن مسعود، وە زيد و أبو الدرداء، وە أبو ذر و ابن عمر، وە ابن عباس و عائشة و أم سلمة) ـ رَضِيَ اللهُ عنهم ـ، وە بەمە قسەیان کردووە هەر یەك لە (مالك والشَّافعي) لە ئەهلی حیجاز، وە (أبو حنيفة والثوري) لە ئەهلی عێراق، وە (الأوزاعي) لە ئەهلی شام، وە (الليث) لە ئەهلی میصر، وە (إسحاق و أبو عبيد) لە ئەهلی حديث، (وداود) لە ئەهلی ظاهر، و أبو هريرة ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ ـ فەرموویەتی : ڕۆژووی بۆ نیە، وە هەمان شتی ڕیوایەت کردووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ ، پاشان لێی گەڕاوەتەوە،

<u>سعيدُ بنُ المسيِّب دەڵێت :</u> أبو هريرة گەڕاوەتەوە لەو فتوایەی، وە گێڕاوەتەوە لە الحسن و سالم بن عبدالله وتویانە : ڕۆژووەکەی تەواو دەکات و دواتر قەزای دەکاتەوە،

وە لە النخعي لە ڕیوایەتێك، ووتویەتی : قەزای دەکاتەوە لە ڕۆژووی فەرزدا بێ لە ڕۆژووی سوننەت،

<u>وە لە عروة و طاوس هاتووە دەڵێن :</u> ئەگەر زانی بە لەشگرانیەکەی لە ڕەمەزاندا و خۆی نەشۆرد هەتا ڕۆژ دەبێتەوە، ئەوا ڕۆژووی شکاوە، وە ئەگەر نەیزانی ئەوە بە ڕۆژووەو نەشکاوە .

[المغني ( ٣/١٤٨)]

// تێبینی : لەم بابەتەدا خیلافێکی کەم هەیە و هەندێك زانا پێیان وایە کە ڕۆژووی شکاوەو دەبێ قەزای بکاتەوە، بەڵام ئەمە ووتەیەکی صەواب نیە و زۆرینەی ئەهلی عیلم لەسەر ئەوەن کە لەشگران تا ڕۆژ دەبێتەوە خۆی نەشوات بە هۆکاری جیماع بێت یان لە خەودا وای لێ هاتبێ کێشەی نیەو ئەتوانێ دوای بانگی بەیانیش خۆی بشوات و ڕۆژووەکەشی دروستەو هیچ کێشەیەکی نیە، وە هەر کەسێکیش بە ڕۆژ بخەوێت و کاتێك هەڵسا لە خەو تووشی لەشگرانی بووبێت ئەویش ڕۆژووەکەی دروستە و هیچ کێشەی نابێ و غوسل دەکات و نوێژەکانی دەکات ، والله اعلم .

## | جوت بوون و جماع لە ڕەمەزاندا ڕۆژوو دەشکێنن لەو شتانە نین بوترێت بیری چوە و نەیزانیوە |

هاتوە لە عبد الرزاق، لە ابْن جريج، دەڵێت : پرسیارم کرد لە  عطاء دەربارەی پیاوێك
بەرکەوتنی هەبوە لەگەڵ خێزانی لە ڕەمەزاندا بیری چوە بەڕۆژوە؟
عطاء فەرمووی : هیچ شتێك لەوانە لەبیرناچێت
دەبێت ڕۆژوەکەی بگرێتەوە، الله عوزری بەشتی وەها نەداوە.

[مصنف عبد الرزاق (٤/٤٧٢)]

أبو داود دەڵێت : بیستم لە ئیمام أحمد پرسیاری لێکرا دەربارەی پیاوێك دەچێتە لای خێزانی بۆ سەرجێی لەبیری چووە کە ڕەمەزانە و بەڕۆژوە

ئیمام فەرمووی : دەترسم بڵێم هیچی لەسەر نیە.
هەروەک عطاء دەی فەرموو : وێنەی ئەمە لەبیر ناچێت .

[مسائل أبي داود(٦٣٥)]

# دەروازەیی چـــوارەم

## | باسی ئەگەر مەنی بەر پۆشاك بكەوێت حوكمی چییە؟ پێویست دەكات پاك بكرێتەوە یان نا؟ |

| باسی ئەو ئاوەی كە دەردەچێت لە نێوان پیاو و ئافرەت ـدا |

٢٥٧ ـ لە دایكە عائشة ـوە ـ رضي الله عنها ـ هاتووە، كە سەبارەت بەو ئاوەی لە نێوان ژن و پیاودا لە (منی و مذی) دەردەچێت و بەر پۆشاك و جەستە دەكەوێت ووتویەتی : رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ مشتێ ئاوی هەڵدەگرت و دەیكرد بە منی ـەكەدا بۆ ئەوەی لێی بكاتەوە، پاشان مشتێ ئاوی تری هەڵدەگرت و دەیكرد بە شوێنەكەیدا بۆ ئەوەی باش پاك ببێتەوە.

٣٧١ ـ لە همام بن الحارث ـەوە هاتووە، كە لە لای دایكە عائشة بووە ـ رضي الله عنها ـ پێشتر ئیحتیلام بوو بوو شوێنەواری بە پۆشاكەكەیەوە بوو، كەنیزەكێكی دایكە عائشة ـ رضي الله عنها ـ چاوی لێ بوو، هەممام شوێنەواری مەنییەكەی دەشت بە پۆشاكەكەیەوە، یان پۆشاكەكەیی دەشت، ئەوەی بۆ دایكە عائشة ـ رضي الله عنها ـ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی : بە دەستی خۆم مەنی ـم بە پۆشاكی رسول الله ـوە ـ صلى الله عليه وسلم ـ ئەپرواند.

٣٧٢ ـ لە دایكە عائشة ـەوە ـ رضي الله عنها ـ دەگێڕنەوە، كە ووتویەتی : بە دەستی خۆم مەنی ـم بە پۆشاكی رسول الله ـوە ـ صلى الله عليه وسلم ـ ئەپرواند، ئەوجا ئەچوو نوێژی پێوە دەكرد.

٣٧٣ ـ له‌ سليمان بن يسار ـه‌وه‌ هاتووه‌، كه‌ ووتويه‌تى : گوێم له‌ دايكه‌ عائشة بوو ـ رضي الله عنها ـ باسى ئه‌وه‌ى ده‌كرد كه‌ مه‌نى به‌ پۆشاكى رسول الله ـوه‌ ـ صلى الله عليه وسلم ـ شۆردووه‌، دايكه‌ عائشة ـ رضي الله عنها ـ ووتى : پاشان شوێنه‌وارى شتنه‌كه‌م به‌ پۆشاكه‌كه‌يه‌وه‌ ده‌بينى.

[سنن أبو داود سليمان بن الأشعث السجستانى ]

# دەروازەیی پــــێنجـەم

## | دەربارەی جیماع کردن یان هاتنەوەی مەنی بە شەهوەت و بێ جیماع|

ئایا حوکمی ئەو پیاو و ژنانە چیە کە لە ڕۆژانی ڕەمەزاندا جیماع دەکەن؟ یان بە شەهوەتەوە مەنیان دێتەوە بێ ئەوەی جیماع بکەن؟

**وەڵام :** ڕۆژوویان دەشکێت و دەبێت قەزای بکەنەوە ئەوانەی جیماعیان کردووە دەبێت کەفارەتی ڕۆژووەکەش بدەن، ئەوانەی بێ جیماع مەنیان دێتەوە جێگای خیلافی زانایانە و هەندێك پێیان وایە تەنها قەزای دەکاتەوە و هەندێکی تریش پێیان وایە دەبێ کەفارەتیشی بدات .

بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم بابەتە دەچینە خزمەت فەرموودەو ووتەی زانایان:

أبو محمد الدارمي لە سنن ـەکەیدا بابێکی داناوە بەناوی :
( فِيمَنْ يَقَعُ عَلَى امْرَأَتِهِ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ نَهَارًا )

واتە: دەربارەی ئەو کەسەی تووشی سەرجێیی دەبێت لەگەڵ خێزانەکەیدا لە ڕەمەزاندا بە ڕۆژ .

حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ دَاوُدَ الْهَاشِمِيُّ ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ ، عَنِ الزُّهْرِيِّ ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ : أَتَى رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلٌ فَقَالَ : هَلَكْتُ. فَقَالَ : " وَمَا أَهْلَكَكَ ؟ ". قَالَ : وَاقَعْتُ امْرَأَتِي فِي شَهْرِ رَمَضَانَ. قَالَ : " فَأَعْتِقْ رَقَبَةً ". قَالَ : لَيْسَ عِنْدِي. قَالَ : " فَصُمْ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ ". قَالَ : لَا أَسْتَطِيعُ. قَالَ : " فَأَطْعِمْ سِتِّينَ مِسْكِينًا ". قَالَ : لَا أَجِدُ. قَالَ : فَأُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِعَرَقٍ فِيهِ تَمْرٌ، فَقَالَ : " أَيْنَ السَّائِلُ ؟ تَصَدَّقْ بِهَذَا ". فَقَالَ : أَعَلَى أَفْقَرَ مِنْ أَهْلِي يَا رَسُولَ اللَّهِ ؟ فَوَاللَّهِ

مَا بَيْنَ لَابَتَيْهَا أَهْلُ بَيْتٍ أَفْقَرُ مِنَّا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " فَأَنْتُمْ إِذَنْ ". وَضَحِكَ حَتَّى بَدَتْ أَنْيَابُهُ.

أَبِي هُرَيْرَةَ ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ ـ دەڵێت : پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری الله ـ صلی الله علیه وسلم ـ و ووتی : بە هیلاك چووم، پێغەمبەری الله ـ صلی الله علیه وسلم ـ فەرمووی : چ شتێك بە هیلاکی داوی؟
ووتی : تووشی سە رجێیی بووم (بە ڕۆژ) لەگەڵ خێزانەکەم لە ڕەمەزاندا،
پێغەمبەری الله ـ صلی الله علیه وسلم ـ فەرمووی : بەندەیەك ئازاد بکە،
پیاوەکە ووتی : نیمە (پارەی کڕینی بەندەیەك تا ئازادی بکەم)،
پێغەمبەری الله ـ صلی الله علیه وسلم ـ فەرمووی : کەواتە دوو مانگ لەسەر یەك بە ڕۆژووبە،
پیاوەکە ووتی : ناتوانم،
پێغەمبەری الله ـ صلی الله علیه وسلم ـ فەرمووی : کەواتە شەست هەژار نان بدە، پیاوەکە ووتی : نیمە،
أَبِي هُرَيْرَةَ دەڵێت : سەبەتەیەکیان هێنا بۆ لای پێغەمبەری الله ـ صلی الله علیه وسلم ـ کە خورمای تیا بوو، پێغەمبەری الله ـ صلی الله علیه وسلم ـ فەرمووی : کوا پرسیارکەرەکە؟ (بڕۆ) ئەوە بکەرە خێر و بیبەخشە،
پیاوەکەش ووتی : ئایا بیبەخشم بە ماڵێکی هەژارتر لە خانەوادەی خۆم ئەی پێغەمبەری الله ـ صلی الله علیه وسلم ـ؟ سوێند بە الله لەوسەر بۆ ئەوسەری بەردە ڕەشەکانی شاری مەدینە ماڵێك نیە لە ئێمە هەژارتر بێت،
پێغەمبەری الله ـ صلی الله علیه وسلم ـ فەرمووی : کەواتە با بۆ ئێوە بێت، وە پێکەنی تاوەکو ددانە خڕێنەکانی دەرکەوتن .

[سنن الدارمي ( ١٧٥٧)، وصحيح البخاري ( ٦٧١١) ، ومسلم ( ١١١١)]

ئەهلی عیلم بێ جیاوازی لەسەر ئەوەن کە ئەگەر کەسێك جیماع بکات لەگەڵ خێزانی لە ڕۆژانی ڕەمەزاندا ئەوا دەبێ ئەو ڕۆژە قەزا بکەنەوەو کەفارەتەکەشی بدەن :

قال أبو داود: سمعت أحمد قال الصائم إذا جامع في رمضان عليه القضاء والكفارة .

أبو داود دەڵێت : بیستم أحمد دەیووت : ئەگەر کەسی بە ڕۆژوو جیماع بکات لە ڕەمەزاندا قەزا کردنەوەو کەفارەتی لەسەرە .

[مسائل أبي داود ( ٦٣٧)]

قال عبدالله : سئل أبي وأنا أسمع عن رجل جامع في شهر رمضان ؟
قال : عليه الكفارة .
قيل لأبي: حديث الزهري عن حميد عن أبي هريرة ؟
قال: نعم.

عبدالله دەڵێت : پرسیار کرا لە باوکم(ئیمام أحمد) وە منیش گوێم لێبوو دەربارەی پیاوێك جیماع بکات لە مانگی ڕەمەزاندا؟
ووتی : کەفارەتی لەسەرە .
ووترا بە باوکم : کەفارەتەکە وەك ئەوەیە لە فەرموودەی (زوهری لە حمید لە أبي هريرة) هاتووە؟
ووتی : بەڵێ .

[مسائل عبدالله (٧١٤)].

قال ابنُ المنذر: لم يختلف أهلُ العِلمِ أنَّ الله عزَّ وجلَّ حَرَّمَ على الصَّائِمِ في نهارِ الصَّومِ الرَّفَثُ، وهو الجِماع .

ابن المنذر دەڵێت : ئەهلی عیلم جیاوازیان تیا نیە کە الله عزوجل حەرامی کردووە لەسەر کەسی بەڕۆژوو لە ڕۆژی بە ڕۆژوودا جیماع بکات .

[الإشراف (٣/١٢٠)].

قال ابنُ قدامة: لا نَعْلَمُ بَيْنَ أَهْلِ الْعِلْمِ خِلَافًا , فِي أَنَّ مَنْ جَامَعَ فِي الْفَرْجِ فَأَنْزَلَ أَوْ لَمْ يُنْزِلْ , أَوْ دُونَ الْفَرْجِ فَأَنْزَلَ , أَنَّهُ يَفْسُدُ صَوْمُهُ إذَا كَانَ عَامِدًا , وَقَدْ دَلَّتْ الأَخْبَارُ الصَّحِيحَةُ عَلَى ذَلِكَ .

ابن قدامة دەڵێت : نازانین لە نێوان ئەهلی عیلم جیاوازی هەبێت لەوەی کە جیماع بکات لە فەرجی خێزانەکەی، جا ئاوی بێتەوە یان نەیەتەوە، یان بێجگە لە فەرج بێت و ئاوی بێتەوە، کە ڕۆژووەکەی بەتاڵ بووەو ئەگەر هاتوو بە عەمدەن وا بکات، وە هەواڵە صەحیحەکان بەڵگەیەو ئاماژە لەسەر ئەمە دەدەن .

[المغني ( ٣/١٣٤)]

قال ابنُ تيمية: ومعلومٌ أنَّ النصَّ والإجماعَ أثبتا الفِطرَ بالأكلِ والشُّربِ والجِماعِ والحَيضِ .

ابن تيمية دەڵێت : زانراوە کە ووتەو ئیجماع جێگیر بووە کە ڕۆژوو دەشکێ بە خواردن و خواردنەوەو جیماع و حەیض .

[مجموع الفتاوى (٢٥/٢٤٤)]

// کەفارەتەکە دەبێت وەکو فەرموودەکە بە دوای یەك بێت نابێ بەئارەزووی خۆت یەکیان هەڵبژێری بەڵکو دەبێت بە ڕیزبەندی بێت :

قال ابن النجار الحنبلي : و كفارته، وكفارة وطء نهار رمضان على الترتيب: عتق رقبة، فإن لم يجد، فصيام شهرين متتابعين، فإن لم يستطع، فإطعام ستين مسكيناً.

ابن النجار الحنبلي دەڵێت : کەفارەتی سەرجێیی کردن لە ڕۆژانی ڕەمەزاندا لەسەر ڕیزبەندیە، دەبێ کۆیلەیەك ئازاد بکات، ئەگەر دەستی نەکەوت، دەبێ دوو مانگ لەسەر یەك بە ڕۆژوو بێت، ئەگەر نەیتوانی، دەبێت خواردنی شەست هەژار بدات .

[منتهى الإرادات ( ٢ / ١٩٠-١٩١ )]

قال ابن مفلح الحنبلي : وَالْكَفَّارَةُ عَلَى التَّرْتِيبِ, فَيَجِبُ عِتْقُ رَقَبَةٍ, فَإِنْ لَمْ يَجِدْهَا صَامَ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ, فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ أَطْعَمَ سِتِّينَ مِسْكِينًا .

ابن مفلح الحنبلي دەڵێت : وە کەفارەت لەسەر ڕیزبەندیە، واجبە دەبێ کۆیلەیەك ئازاد بکات، ئەگەر دەستی نەکەوت دوو مانگ لەسەر یەك بە ڕۆژوو دەبێت، ئەگەر نەیتوانی خواردنی شەست هەژار دەدات .

[فروع لإبن مفلح (٥/٥٤)]

// ئەگەر ماچی خێزانی بکات یان دەستی لێ بکات یان سەری بکات و شەهوەتی بجوڵێت و مەنی بێتەوە، لەسەر ڕای جمهوری زانایان ڕۆژووی دەشکێت و دەبێت قەزای بکاتەوە بەڵام کەفارەتی لەسەر نیە، وە هەندێك لە زانایانیش دەڵێن : کەفارەتیشی لەسەر، بەڵام جمهوری زانایان لە مەزاهیب و غەیری مەزاهیبیش دەڵێن کەفارەتی لەسەر نیە چونکە ئەمە وەکو جیماع نیە کە لە فەرموودەکە هاتووە .

ابن أبي شيبة لە مصنف ـەکەیدا بابێکی داناوە بەناوی :[ (٦٨) ما قالوا في الصائم يفطر حين يمني ]

واته: ئەوەی وتراوە لەبارەی کەسێ بە ڕۆژوو کە ڕۆژووی کاتێك مەنی بێتەوە .

٩٥٧٠- حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنْ عَطَاءٍ، قَالَ: إِذَا أَمْنَى الصَّائِمُ فَقَدْ أَفْطَرَ.

عَطَاءٍ دەڵێت : ئەگەر کەسێ بە ڕۆژوو مەنی هاتەوە ئەوە ڕۆژووی شکاوە.

٩٥٧١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَكْرٍ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنْ عَطَاءٍ، قَالَ: إِذَا أَمْنَى الصَّائِمُ أَفْطَرَ، قُلْتُ: يُكَفِّرُ كَفَّارَةَ الْمَنِيِّ؟ قَالَ: نَعَمْ.

عَطَاءٍ دەڵێت : ئەگەر کەسێ بە ڕۆژوو مەنی هاتەوە ئەوە ڕۆژووی شکاوە ، ابْنِ جُرَيْجٍ دەڵێت وتم : کەفارەتی دەکەوێتە سەر بۆ مەنی؟ وتی : بەڵێ.

٩٥٧٢- حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، عَنْ هِشَامٍ، عَنِ الْحَسَنِ، قَالَ: إِذَا قَبَّلَ، أَوْ لَمَسَ وَهُوَ صَائِمٌ فَأَمْنَى، فَهُوَ بِمَنْزِلَةِ الْمُجَامِعِ.

الْحَسَنِ البصري دەڵێت : ئەگەر ماچی بکات یان دەستی لێ بدات و بە ڕۆژوو بێت و مەنی بێتەوە ، ئەوە وەکو جیماع کردن وایە .

٩٥٧٣- حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، عَنْ حَبِيبٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ هَرِمٍ، قَالَ: سُئِلَ جَابِرُ بْنُ زَيْدٍ عَنْ رَجُلٍ نَظَرَ إِلَى امْرَأَتِهِ فِي رَمَضَانَ، فَأَمْنَى مِنْ شَهْوَتِهَا، هَلْ يُفْطِرُ؟ قَالَ: لاَ، وَيُتِمُّ صَوْمَهُ.

عَمْرِو بْنِ هَرِمٍ دەڵێت : پرسیار کرا لە جَابِرُ بْنُ زَيْدٍ دەربارەی پیاوێك سەیری خێزانەکەی دەکات لە ڕەمەزاندا، وە شەهوەتی دەجوڵێ و مەنی دێتەوە، ئایا ڕۆژووی دەشکێ ؟

ووتی : نا، ڕۆژووەکەی تەواو دەکات .

٩٥٧٤- حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ جَابِرٍ، عَنْ عَامِرٍ؛ فِي الصَّائِمِ يُلاَعِبُ امْرَأَتَهُ حَتَّى يُمْذِيَ، أَوْ يُودِيَ، قَالَ: لاَ يُوجِبُ عَلَيْهِ الْقَضَاءَ إِلاَّ مَا أَوْجَبَ عَلَيْهِ الْغُسْلَ.

عَامِرٍ(الشعبي) لە بارەی کەسی بەڕۆژوو یاری دەکات لەگەڵ خێزانەکەی هەتا مەذی یان وەدی دێتەوە دەڵێت : قەزاکردنەوەی لەسەر واجب ناکات تەنها ئەوە نەبێت کە غوسل واجب دەکات لەسەری . (واتە مەنی)

٩٥٧٥- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنْ عَطَاءٍ، قَالَ: إِنْ أَمْنَى الصَّائِمُ أَفْطَرَ.

عَطَاءٍ دەڵێت : گەر کەسی بەڕۆژوو مەنی هات ڕۆژووی شکاوە .

[مصنف ابن أبي شيبة]

// ئەوەی لێرە ابن أبي شيبة هێنای لە ووتەی (عطاء و الحسن البصري) ئەوە دیارە کە کەفارەتیشی لەسەرە ئەوەی ماچ بکات یان دەست لە خێزانی بدات و مەنی بێتەوە، بەڵام ڕای جیاوازیشی تیایە و جمهوری زانایانیش لەسەر ئەوەن کە ڕۆژووی دەشکێت بەڵام کەفارەتی لەسەر نیە .

قال ابنُ قدامة: إذا قبل فأمنى أو أمذى ولا يخلو المقبل من ثلاثة أحوال ...، الحالُ الثاني: أنْ يُمنِيَ: فيُفطِرُ بغيرِ خلافٍ نَعلَمُه؛ لِمَا ذَكَرْناه من إيماءِ الخبرينِ، ولأنَّه إنزالٌ بمباشَرةٍ فأشبَهَ الإنزالَ بالجِماع دون الفَرجِ .

ابن قدامة دەڵێت : ئەگەر ماچی خێزانی کردوو مەنی هات یان مەذی وە ماچ کردن لە سێ حاڵەت بەدەر نابێ،

حاڵەتی یەکەم ابن قدامة باسی دەکات کە ماچی خێزان دروستە بەبێ ئەوەی ئاوت بێتەوە و بەڵگەی فەرموودە دێنێتەوە،
دواتر دەچێتە سەر حاڵەتی دووەم کە لەسەر بابەتەکەی ئێمەیە،
وە خاڵی سێیەمیش باسی مەذی دەکات کە جێگای خیلافە لێرە باسی ناکەین،
ابن قدامة دەڵێ حاڵەتی دووەم : ئەوەیە کە مەنی بێتەوە، ڕۆژووی پێ دەشکێ بە بێ خیلافێك زانیبێتم، بۆ ئەوەی ئاماژەمان پێدا بەو دوو هەواڵە، وە لەبەر ئەوەی ئاو هاتنەوە بە دەستبازی وەکو ئاو هاتنەوە وایە بە جیماع کردن بەبێ فەرج .

[المغني ( ٣/١٢٧)]

قال الماوردي: أمَّا إنْ وَطِئَ دونَ الفَرجِ أو قبَّلَ أو باشَرَ فلم يُنزِل؛ فهو على صَومِه لا قضاءَ عليه، ولا كفَّارةَ، وإن أنزَلَ فقد أفطر، ولَزِمَه القضاءُ إجماعًا .

الماوردي دەڵێت : ئەما ئەوەی سەرجێیی بکات بەبێ چونە لای فەرج یان ماچی بکات یان دەستبازی لەگەڵ بکات ئاوی نەیەتەوە، ئەوە لەسەر ڕۆژووەکەیەتی قەزاکردنەوەی لەسەر نیە، وە کەفارەتیشی لەسەر نیە، وە ئەگەر ئاوی هاتەوە ئەوە ڕۆژووی شکاوە، وە پێویستە قەزای بکاتەوە بە کۆدەنگی هەموو زانایان .

[الحاوي الكبير (٣/٤٣٥)]

// تێبینی : بۆ بابەتی خۆ ڕەحەت کردن بە دەست (الاستمناء) پێویست ناکات هیچی لەسەر بڵێم شتێکی ئاشکراو دیارە حوکمەکەی بەبێ خیلاف ڕۆژووی پێ دەشکێت و دەبێت قەزای بکاتەوە بە کۆدەنگی هەموو مەزاهیب و زانایان، والله اعلم .

# دەروازەیی شــــەشــــەم

## | ناساندنێك دەربارەیی خوێنی (حیض، نیفاس، استحاضة |

هەر بابەتێك كە لە فقهدا باس دەكرێتت دوو پێناسەیی هەیە یەكەمیان لە ڕوویی زمانەوانی(لوغە)، دووەمیان لە ڕووی شەرع، ئێمە لێرە پێناسەی ئەو جۆرەیی خوێن لە ڕووی زمانەوانییەوە پێناسەكەیی دەنوسین.

1. **حیض (سوڕی مانگانە) :** خوێنێكی ئاسایی و سرووشتیە، لە بن منداڵدانەوە دەردەچێت لەكاتێكی دیاریكراودا، لە حاڵەتی تەندرووستی ئافرەتدا (چونكە كە ئافرەتت كێشەیی هەبێتت حیض ـی نابێت جا بەهەر هۆكارێك بێت)، بە بێ هۆكاری منداڵ بوون.

2. **نیفاس (زەیستانی) :** ئەو خوێنەیە كە لە دامێنی ئافرەت دەردەچێت بەهۆیی منالڵ بوونەوە، ئەو خوێنە ماوەییە كە لەكاتی دووگیانیدا قەتیس بووە، وە هەمان سیفاتی خوێنی حیض ـی هەیە.

3. **استحاضة (نەزیف یان خوێن پچڕان) :** خوێنێكی بەردەوامە، هەندێ جار بەهۆیی پچڕانی دەمارێكەوە توش دەبێتت، خوێنی نەزیف پێچەوانەیی خوێنی سوڕی مانگانەیە لەڕووی حوكم و لەڕووی شێوازیشەوە، ئافرەتی نەزیف حوكمی پاكەكانی هەیە لە هەموو شتێكدا، ڕۆژووەكەی دروستە، نوێژەكەی، تەواف كردنی، هەروەها دەست دان لە قورئان و خوێندنی قورئان و جیماع كردنیشی حەڵاڵە، هیچ جیاوازییەك نییە لە نێوان ئافرەتی نەزیف و پاك لە هیچ شتێك لە حوكمەكان تەنها لە واجبێتی دەست نوێژ كە دەبێتت بۆ هەموو نوێژێك دەست نوێژبگرێت لەكاتی نوێژەكە.

-کەمترین تەمەنی سووڕی مانگانە تەواوکردنی نۆساڵیە

- وە زۆرەکەی پەنجا ساڵیە

- وە ئافرەتی دووگیان تووشی سووڕی مانگانە نابێت

- وە کەمترینەکەی ڕۆژ و شەوێکە

- وە زۆرترینەکەی پانزە ڕۆژە

- وە بە گشتی شەش یان حەوت - ڕۆژ - ـە

- وە کەمترین پاکێتی لە نێوان دوو سووڕی مانگانەدا سیانزە ڕۆژە

- وە بە گشتی پاکێتیەکە ئەوەندەیە کە ماوەتەوە لە مانگەکەدا

- وە سنوور نییە بۆ زۆریەکەی

---

: منداڵدانی ئافرەت مانگانە دیوارێک دروست ئەکات بە مەبەستی پیتان و جێگیربوونی هێلکە لەسەری، کاتێک هێلکەکە تووشی پیتاندن نابێت دیوارەکە وەکو خوێن دێتە دەرەوە بە چەند جارێک .

کەمترین تەمەنی سووڕی مانگانە تەواوکردنی ٩ ساڵیە، واتە ئەگەر لە خوار ئەو تەمەنەوە خوێنی بینی ئەوە حسابی خوێنی الإستحاضة ـی بۆ ئەکرێت نەک سووڕی مانگانە .

وە زۆرترین تەمەنی سووڕی مانگانە ٥٠ ساڵیە، واتە ئافرەتێکی سەرو ٥٠ ساڵ کاتێک خوێن ئەبینێت ئەوە هی الإستحاضة ـیە نەوەک سووڕی مانگانە .

وە حوکمی خوێنی الإستحاضة بەم شێوەیەیە : کاتێک ئافرەتێک تووشی الإستحاضة ئەبێت سێ هەڵبژاردەی لە بەردەمدایە، وە هەندێکیان لە هەندێکی تریان ئاسانترن و بەپێی توانای خۆی هەرکامیانی توانی ئەتوانێت ئەنجامی بدات .

1. یان بۆ هەموو نوێژێک غوسل دەربکات، ئەمەش قورسترینە، ڕۆژی ٥ غوسل ئەکات .

2. یاخود نوێژەکان کۆبکاتەوە و غوسل دەربکات، ڕۆژی ٣ غوسل ئەکات، ئەمەش مامناوەندە .

3. یان غوسل دەرنەکات، بەڵکو بۆ هەموو نوێژێک دەستنوێژ بگرێت، ئەمەش ئاسانترینە .

* الإستحاضة خوێنێکە ئافرەت تووشی ئەبێت بەهۆی بڕانی دەمارێک یان بریندار بوونی ناوەوەی داوێنی .

* وە ئافرەتی دووگیان تووشی سووڕی مانگانە نابێت، ئەگەر خوێنی بینی کاتێک دووگیانە لە دوو حاڵەت تێپەڕ نابێت، ئەگەر نزیک کاتی منداڵبوون بوو; ئەوە بە خوێنی زەیستانی حسابە، ئەگەر لە ناوەڕاستی دووگیانیەکەی یان دوور لە منداڵبوون بوو; ئەوە حسابی خوێنی الإستحاضة ـی بۆ ئەکرێت .

وە کەمترین ماوەی سووڕی مانگانە; ١ ڕۆژ و شەوە لە مانگێکدا، وە زۆرترین کاتی بریتیە لە ١٥ ڕۆژ و شەو، وە بە گشتی لە زۆربەی ئافرەتاندا ماوەی ٦ بۆ ٧ ڕۆژە .

وە کەمترین ماوەی پاکێتی لەنێوان دوو سووڕی مانگانەدا ١٣ ڕۆژە، وە سنوور نییە بۆ زۆری پاکێتی .

واتە ئەکرێت ئافرەتێک هەبێت بە چەند مانگ جارێک تووشی سووڕی مانگانە ببێت، لەبەر ئەوە سنوور نییە بۆ پاکێتی ئافرەت لە سووڕی مانگانە .

وە إبن تیمیة بەڵگە بەم ئایەتە ئەهێنێتەوە | وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡمَحِيضِۖ قُلۡ هُوَ أَذٗى : وە پرسیارت لێ ئەکەن دەربارەی سووڕی مانگانە، بڵێ ئەوە ئێش و ئازارە | (البَقَرَة : ٢٢٢) و ئەوە هەڵئەبژێرێت کە کات دیاری ناکرێت لە کەمی یان زۆری تەمەن، وە کەمی و زۆری ماوەی سووڕی مانگانە لە مانگەدا; بۆ سووڕی مانگانە، چونکە الله عز وجل ئەفەرمووێت سووڕی مانگانە | أَذًى | یە، واتە ئێش و ئازارە، بەو هۆیە ئەگەر ژنێکی تەمەن ٥٥ یان ٦٠ساڵیش خوێنی بینی، یان ئافرەتێک ٢٠ ڕۆژ لە مانگێکدا خوێنی بینی و نیشانەکانی سووڕی مانگانەی لێ دەرکەوت وەکو سەر ئێشە و پشت ئێشە و ناوسک ئێشە; ئەوە بە سووڕی مانگانە حساب ئەکرێت نەوەک الإستحاضة .

// زۆرینەی فقهاء و زانایان لەسەر ئەوەن کە ئافرەتی دوگیان توشی سوڕی مانگانە نابێت بۆیە گەر خوێنیش ببینێت لەو کاتە دەبێت خۆی بشوات و نوێژەکانی بکات (وە بۆ هەموو نوێژێك دەستت نوێژ تازەدەکاتەوە لەکاتی نوێژکردنەکەی نەك پێش کاتی نوێژ، گەر غوسڵی دەرنەکرد بۆ نوێژەکانی)

ئەمەش ڕای سەلەف و هاوەڵانە لەوانە:

(ئیمامی أحمد و اسحاق و ابو عبید و نخعی و قدامة و سعید بن المسیَّب، والحسن، وعطاء، والحَكم بن عُتيبة، والنَّخَعيُّ، والشَّعبيُّ، وحمَّاد بن أبي سليمان، وسليمان بن يَسار، ونافع مولى ابن عمر, وتەیەک لە الزُّهريِّ, و سفيان الثوريِّ، والأوزاعيِّ، وأبي عُبيد، وأبي ثورە
وعائشة والحسن وعطاء وإبراهيم وسليمان بن يسار والحكم وحماد وجابر بن زيد وعكرمة )

---

**سەرچاوەکان**
مسائل الكوسج (٧٤٦)
أبو داود في روايته صـ ٣٨ مسألة (١٧٢)
وابنه أبو الفضل صالح صـ١٩٣مسألة (٦٤٩)
مسائل البغوي (٦٤)
المحلى (١/٢٤٢)، الاستذكار لابن عبدِ البَرِّ (١/٣٢٧)، المغني لابن قدامة(١/٢٦١).
مصنف ابن أبي شيبة(٢/٢٦)

بەڵام گەر ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ پێش دانانی حەملەکەی خوێنی دی ئەو خوێنە نوێژ کردنی لێ مەنعەکات.

کەمترینی حەمل شەش مانگە بەڵام زۆرترینی تا چوار ساڵ دەڕوات ئەمە ڕای (ئیمام أحمد و ئەهلی مەدینەیە) لەسەروو هەموشیان (مالك بن أنس)

ابن عجلان کە موسلیم سیازدە حەدیثی لێ گێڕاوەتەوە وە نسائی و احمد و ابن معین و ابوحاتمی ڕازی تەوثیقیان کردوە سێ ساڵ لەسکی دایکی بوو.
بۆیە ئاساییە ڕودانی شتی لەوجۆرە.

## // ئافرەتێك كە لە حيض دابێت  دەشت لەسەری ڕێگری کراوە :

1. ئەنجامدانی نوێژ
2. بەڕۆژوو بوون
3. واجب بونی ( واتە واجبێتی گێڕانەوەکەی )
4. خوێندنی قورئان
5. دەستدان لە مصحف
6. مانەوە لە مزگەوت
7. طەوافی کەعبە ( لەعەمرەبێت یان حەج)
8. جوت بوون جیماع
9. تەڵاق ( لەکاتی حەیضدا نابێت تەڵاق بدرێت  چونکە بیدعەیە)
10. عیدەی تەڵاق دراو بە مانگ ( دەبێت بە پاك بونەوە یان حەیض بوون حسابی کات نەك بە مانگ چونکە جیاوازی هەیە کە ئایا قروء حەیضە یان طهرە).

[المقنع لإبن قدامة الحنبلي]

* وە چوونەلای لە داوێنیەوە (واتە گەر پیاو بچێتە لای خێزانی جیماع بکەن) ئەم حوکمانەیی لەسەر واجب دەبێت :

- وە واجبە تیایدا دینارێک یان نیوەی وەکو کەفارەت .(واتە گەر لەسەرەتایی حیض ـەکەی بوو دینارێك کەفارەتە، وە گەر لە ناوەڕاست و کۆتایی بوو نیو دینار کەفاریەتی)

- وە المباشرة حەڵاڵە لە جگە لە داوێن .

---

: حەرامە لەسەر ئافرەتێک کە لە سووڕی مانگانەدایە، یاخود خوێنی زەیستانی هەیە; نوێژ بکات و ڕۆژوو بگرێت، دواتر کە سووڕی مانگانە

یان زەیستانیەکەی تەواو بوو ڕۆژووەکانی ئەگێڕێتەوە بەڵام نوێژ ناگێڕێتەوە .

وە حەرامە لەسەر پیاوەکەی لە داوێنەوە بڕواتەلای، ئەگەر بڕوات ئەبێت یەک دینار کە ئەکاتە چوار گرام و چارەکێک زێڕ یان نیوەی ئەوە وەکو کەفارەت بدات .

وە حەرامە کاتێک خێزانی لە سووڕی مانگانە پاک ئەبێتەوە پێش ئەوەی غوسل دەربکات بڕواتە لای، وە ئەگەر بشڕواتە لای ئەوە هیچی وەکو کەفارەت لەسەر نییە .

وە جگە لە چوونە لای ئافرەت لە داوێنەوە لەکاتی سووڕی مانگانە و زەیستانیدا; المُباشَرَة کە بریتیە لە بەریەککەوتنی جەستەی پیاو و ژن بەبێ دُخُول; ڕێگە پێدراوە .

- وە زەیستانی سنوور نیە بۆ کەمەکەی .

- وە زۆرەکەی چل ڕۆژە .

- وە حوکمەکەی جێگیر ئەبێت بە دانانی ئەوەی دروستکراوێتی مرۆڤی لێوە ڕوون ببێتەوە .

- وە کاتی پاکبوونەوەکەی نەمانی خوێنە .

- وە جیماع تیایدا بێزراوە .

- وە وەکو سووڕ مانگانەیە لە حوکمەکانیدا جگە لە .

1. عِدَّةٍ : عیددە .

2. وَبُلُوغٍ : وە باڵغ بوون .

---

: کاتێک ئافرەت منداڵی ئەبێت تووشی خوێنی زەیستانی ئەبێت، زۆرترین ماوەی خوێنی زەیستانی ٤٠ ڕۆژە، زیاتر لە ٤٠ ڕۆژ بە الإستحاضة حسابە .

وە ئەگەر ئافرەتەکە تووشی لەبارچوون بوو، حوکمی زەیستانی بەسەردا نادرێت هەتا ئەو منداڵەی لەباری چووە دروست بووبێت، واتە سەروشکڵی مرۆڤی گرتبێت نەوەک تەنها پارچە گۆشتێک بێت و تەواو .

لای فقهاء موستەحەببە منداڵی لەبار چوو ناوی لێ بنرێت جائایا بەچوار مانگی لەسکی دایکی مردوە یان لەدایك دەبێت پاشان دەمرێت پێش ناونانی.

وەئەگەر ڕەگەزی نەزانرا باشترە ناوێکی لێبنرێت بۆ هەردوو ڕەگەزەکە بشێت.

[أحكام الجنائز]

ابن هانئ قوتابی ئیمام أحمد دەڵێت : ووتم بە پێشەوا أحمد ئەگەر ئافرەت منداڵێکی مردوی بوو چوار مانگ یان کەمتر لەچوار مانگ چی لێکات؟
فەرمووی : گەر گەشتە چوار مانگ ئەوا دەشۆردرێت و کفنە کرێت و نوێژی لەسەر دەکرێت.
دواتر لێی دەپرسێتەوە تاکەی ڕۆح دەکرێتە بەری؟
فەرمووی : کاتێك چوار مانگی تەواو کرد.

[مسائل ابن هانئ]

وە جیماع کردن لەگەڵ ئافرەتێکدا کە لە خوێنی زەیستانی پاک بووەتەوە و غوسلی دەرکردووە مەکروهە هەتا ٤٠ ڕۆژەکە تەواو نەکات .

وە إبن تیمیة ئەوە هەڵئەبژێرێت کە مەکروهـ نییە و هەر ئافرەتێک پاک بوویەوە لە خوێنی زەیستانی پێش ٤٠ ڕۆژ و، غوسلی دەرکرد و، ئەو ئێش و ئازارانەی نەما کە بەهۆی زەیستانیەوە تووشی بووە ئەوە هاوسەرەکەی ئەتوانێت بڕواتە لای .

زەیستانی لە زۆربەی حوکمەکاندا وەکو سووڕی مانگانە وایە، بۆ نمونە لە هەردوو حاڵەتەکەدا نوێژکردن و ڕۆژووگرتن و چوونە لای لە داوێنەوە حەرامە .

وە ئەگەر کەسێک ڕۆشتە لای خێزانی لە هەردوو حاڵەتەکەدا ئەبێت کەفارەتی تاوانەکەی بدات، وە لە بابەتەکانی دیکەشدا وەکو یەکن جگە لەو دووانە نەبێت کە نووسەر باسیان ئەکات .

**یەکەم :** عیددە، خوێنی سووڕی مانگانە لە عیددە حسابە، بەڵام هی زەیستانی لە عیددە حساب نییە .

عیددە ئەو ماوەیەیە کاتێک ئافرەت تەڵاق ئەدرێت ئەبێت بمێنێتەوە تا سێ جار تووشی سووڕی مانگانە ئەبێت و پاک ئەبێتەوە هەتا بەتەواوی دەربکەوێت تووشی دووگیانی نەبووە و مەنی پیاوەکەی پێشووی هەڵنەگرتووە .

**دووەم :** باڵغ بوون، واتە بە خوێنی سووڕی مانگانە دیاری ئەکرێت ئافرەتەکە باڵغ بووە بەڵام بە خوێنی زەیستانی دیاری ناکرێت . واللە تعالی أعلم

[بداية العابد وكفاية الزاهد]

# دەروازەیی حـــــەوتـــەم

## | باسی کەسێ کاری سەرجێگەبکات بەڵام ئاوی نەیەتەوە |

٢١٤ ـ لە أُبي بن كعب ـەوە هاتووە، کە رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرموویەتی : بێگومان خۆنەشوشتن لەدوایی ئەنجامدانی کاری سەرجێگە لەکاتێکدا کە ئاو نەیەتەوە ئەو کارە لەسەرەتای ئیسلامەوە ڕوخسەتێ بوو بۆ خەڵك لەبەر کەمی پۆشاك، پاشان رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرمانی کرد بە خۆشوشتن و ئەو کارەی قەدەغەکرد.

أبو داود دەڵێت : واتە خۆشوشتن بە ئاو پێویست دەبێت بە هاتنەوەی ئاوی مەنی.

٢١٥ ـ أُبي بن كعب دەڵێت : ئەو فەتوایەی کە داویانە : خۆشوشتن بە ئاو پێویست دەبێت بە هاتنەوەی ئاوی مەنی، ئەو کارە لەسەرەتای اسلامەوە ڕوخسەتێ بوو لەلایەن رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ دوای ئەوە فەرمانی کرد بە خۆشوشتن با ئاویشی نەیەتەوە.

٢١٦ ـ لە أبي هريرة ـ رضي الله عنه ـ دەگێڕنەوە، کە رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرموویەتی : ئەگەر لەنێوان هەر چوارپەلیدا دانیشت، هەر دوو شوێنی خەتەنە بەیەك گەیشتن(واتە سەری ئەندامی نێرینە چووە ژوورەوە بۆ ناو ئەندامی مێیینە) ئەوە خۆشوشتن واجب دەبێت، ئیتر ئاوی بێتەوە یان نا.

٢١٧ ـ لە ابي سعيد الخدری هاتووە، کە رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرموویەتی : خۆشوشتن بە ئاو پێویست دەبێت بە هاتنەوەی ئاوی مەنی.

أبو سلمة ئەو کارەی کردووەو پێی وابووە کە پێویست بە خۆشوشتن ناکات بە هاتنەوەی ئاوی مەنی نەبێت.

## | باسی دووبارە کردنەوەی کاری سەرجێگە لەلایەن لەشگرانەوە |

٢١٨ ـ لە أنس ـوە ـ رضي الله عنه ـ هاتووە، كە رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ شەوێكیان گەڕابەسەر هەموو خێزانەكانیدا ویەك جار خۆیی شت.

## | باسی دەستنوێژگرتن لەدوای كاری سەر جێگە جیماع كردن |

٢١٩ ـ لە أبي رافع ـەوە هاتووە، كە رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ شەوێكیان گەڕا بەسەر هەموو خێزانەكانیداو لەلای هەر یەكێكیان خۆی دەشت، أبو رافع ووتی : منیش ووتم : ئەی رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ بۆچی بۆ هەموویان یەك جار خۆت نەشت؟
ئەویش فەرمووی : ئەمەیان جوانترەو چاكترو پاكترە.

أبو داود دەڵێت : فەرموودەكەی أنس كە ڕابوورد(صحیح) ترە لەم فەرموودەی ابو رافع.

٢٢٠ ـ لە أبی سعید الخدری هاتووە، كە رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرموویەتی : ئەگەر كەسێك لە ئێوە چووە لای خێزانی خۆی، جیماع ـی كرد ویستی دووبارەی بكاتەوە با لە نێوانیاندا دەستنوێژێ بگرێت.

## | باسی ئایا لەشگران بۆی هەیە بخەوێت پێش ئەوەی خۆی بشوات؟ |

٢٢١ ـ لە عبدالله بن عمر ـ رضي الله عنه ـ هاتووە، كە ووتویەتی : باوكم بۆ رسول الله ـی ـ صلى الله عليه وسلم ـ گێڕایەوە، كە لە شەودا تووشی لەشگرانی بووە، ئەویش پێی فەرموو : زەكەرت بشۆ و دەستنوێژ بگرە ئەونجا بخەوە.

## | باسی ئایا لەشگران بۆی هەیە بخوات پێش ئەوەی خۆی بشوات؟ |

٢٢٢ ـ لە عائشة ـوە ـ رضي الله عنها ـ دەگێڕنەوە، كە رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ كاتێ كە لەشگران بووایە ئەگەر بیویستایە بخەوێت دەستنوێژێكی دەگرت وەك چۆن دەستنوێژی دەگرت بۆ نوێژكردن.

٢٢٣ ـ لە الزهری ـەوە بەهەمان سەنەد و مانا هاتووە، وە ئەمەی بۆ زیاد كردووە، رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ كاتێ كە لەشگران بووایە ئەگەر بیویستایە بخوات دەستەكانی دەشت، كەواتە ئەو دوو فەرمودەی پێشەوە بەڵگەن لەسەر ئەوەی كە لەشگران بۆی هەیە بخوات و بخواتەوە بەبێ ئەوەی دەستنوێژبگرێت یان خۆی بشوات.

## | باسی ئەوانەی كە دەڵێت لەشگران دەبێ دەستنوێژ بگرێ |

٢٢٤ ـ لە عائشة ـوە ـ رضي الله عنها ـ دەگێڕنەوە، كە رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ كاتێ كە بیویستایە بخوات یان بخەوێت دەستنوێژی دەگرت، واتە ئەگەر لەشگران بووایە.

٢٢٥ ـ لە عمار بن یاسر ـ رضي الله عنه ـ هاتووە، كە رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ روخسەتی داوە بە لەشگران ئەگەر ویستی بخوات و بخواتەوە یان بخەوێت دەستنوێژی بگرێت.

أبو داود دەڵێت : لەشگران ئەگەر وویستی بخوات با دەستنوێژ بگرێت.

## | باسی ئایا دواخستنی خۆشوشتن لەلایەن لەشگرانەوە پێی گوناهبار دەبێت؟ |

٢٢٦ ـ لە غضيف بن الحارث دەڵێت : ووتم بە دایکە عائشة ـ رضي الله عنه ـ پێم بڵێ رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ ئەگەر لەشگران بوایە لەسەرەتای شەوەوە خۆی دەشت یان لە کۆتایی شەو؟
دەیکە عائیشە فەرمووی : جاری وا هەبوو لەسەرەتای شەوەوە خۆی دەشت، جاری واش هەبوو لە کۆتایی شەودا خۆی دەشت،
ووتم : الله أكبر! گەورەیی هەر بۆ الله یە سوپاس و ستایش بۆ الله چەندە ئاسانکاری بۆ کردووین لە شەرعەکەیدا.
ووتم : پێم بڵێ رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ لەسەرەتای شەوەوە نوێژی وەتری دەکرد یان لە کۆتایی شەودا؟
دایکە عائشە فەرمووی : جاری وا هەبوو لەسەرەتایی شەوەوە نوێژی وەتری دەکرد، جاری واش هەبووە لە کۆتایی شەودا،
ووتم : الله أكبر! گەورەیی هەر بۆ الله یە سوپاس و ستایش بۆ الله چەندە ئاسانکاری بۆ کردووین لە شەرعەکەیدا.
ووتم : ئایا رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ بەدەنگەوە قورئانی دەخوێند یان بە بێ دەنگی؟
دایکە عائیشە فەرمووی : جاری وا هەبوو بە دەنگەوە قورئانی دەخوێند، جاری واش هەبووە بە بێ دەنگی.
ووتم : الله أكبر! گەورەیی هەر بۆ الله یە سوپاس و ستایش بۆ الله چەندە ئاسانکاری بۆ کردووین لە شەرعەکەیدا.

٢٢٧ ـ لە علي بن أبي طالب ـ رضي الله عنه ـ هاتووە، کە رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرموویەتی : مەلائیکە ناچێتە ماڵێکەوە کە وێنە و سەگ و لەشگرانی تێدابێت.

[سنن أبو داود السجستاني]

## | ئایا تاوانبار دەبێت شەو تا بەیانی بە لەشگرانیەوە بمێنیتەوە؟ |

دەبێت ئەوە بزانین کە حەرامە لەسەر کەسی لەشگران کە نوێژ بکات و تەواف بکات و لە مزگەوتدا بمێنێتەوە و قورئان بخوێنێ و دەستی لێبدات.
وە باشتر و چاکتر وایە بۆ ئەو کەسەی کە لەشی گرانە پەلەبکات بۆ خۆشۆردن نەوەک لە بیری بچێت، یان خەوی لێبکەوێت و بۆ نوێژەکەی خەبەری نەبێتەوە یان درەنگ خەبەریان بێتەوە و تاوەکو خۆیا بشۆن نوێژەکەیان لە دەست بڕوات، وەئەگەر کەسی لەشگران ویستی بە لەشگرانیەوە بخەوێ یان خواردن بخوات یان دووبارە جووت ببێ لەگەڵ خێزانی ئەوا سوننەتە کەوا دەست نوێژ بگرێت .
دایکی ئیمانداران خاتو عائشة ـ ڕەزای الله تعالی ـی لێبێت ـ دەفەرمووێ : پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ ئەگەر لەشی گران بوایە و بیویستایە خواردن بخوات یان بخەوێ ئەوا دەستنوێژی دەگرت وەکو ئەو دەست نوێژەی کە بۆ نوێژ دەگیرێت .

[رواه مسلم (٣٠٥)]

# دەروازەیی هـــەشـــــتـەم

## | باسی ئایا دروستە لەشگران لەگەڵ خەڵك تەوقەبكات؟ |

٢٣٠ ـ لە حذیفة ـوە هاتووە، کە رسول الله ـ صلی الله علیه وسلم ـ ی پێی گەیشتووە دەستی هێناوە تەوقەی لەگەڵ بکات و ووتویەتی : من لەشگرانم، رسول الله ـ صلی الله علیه وسلم ـ فەرموویەتی : بێگومان موسڵمان پیس نابێت.

٢٣١ ـ لە ابی هریرة ـ رضي الله عنه ـ هاتووە، کە ووتویەتی : جارێ لە یەکێ لە ڕێگاکانی مەدینە توشی رسول الله ـ صلی الله علیه وسلم ـ بووم، لەشگران بووم، لەبەرئەوە خۆم لێ شاردەوە، چووم خۆم شت و هاتمەوە بۆلای،
فەرمووی : ئەی ابی هریرة لەکوێ بوویت؟
ووتم : ڕاستیەکەی من لەشگران بووم بۆیە پێم خۆش نەبوو بە لەشی پیسەوە لەخزمەتتدا دانیشم ،
فەرمووی رسول الله ـ صلی الله علیه وسلم ـ پاك و بێگەردی بۆ الله موسڵمان چۆن پیس دەبێت.

## | باسی ئەگەر لەشگران بچێتە مزگەوتەوەحوکمی چییە؟ |

٢٣٢ ـ لە عائشة ـ رضي الله تعالی عنها ـ هاتووە، کە ووتویەتی : رسول الله ـ صلی الله علیه وسلم ـ هات بینی دەرگای ماڵی هەندێ لە هاوەڵەکانی کەلە دەوری مزگەوت بوون بەسەر مزگەوتدا دەکرانەوەو هاتوچۆیان بە مزگەتەکەیدا دەکرد، رسول الله ـ صلی الله علیه وسلم ـ پێی فەرموون : ڕووی دەرگای ماڵەکانتان بگۆڕن بۆ لایەکی تر با لەسەر مزگەوت نەبن. پاشان چووە ژوورەوە خەڵکەکە هیچ کارێکیان نەکرد بەهیوای ئەوەی کە ڕوخسەتیان پێ بدات، لەدواییدا رسول الله ـ صلی الله علیه وسلم ـ هاتەوەدەرەوە بۆ لایان و فەرمووی : ڕووی دەرگای ماڵەکانتان بگۆڕن بۆ

لایەکی تر، چونکە من ڕێگەنادەم لەشگران و ئافرەتی بێ نوێژ بچنە مزگەوتەوە.

## | باسی کەسێ لەبیری چووبێ کە لەشگرانە بەرنوێژی بۆ کۆمەڵێ بکات|

٢٣٣ ـ له أبي بكرة ـەوه هاتووه، كه رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ نوێژی بەیانی دابەست بەدەستی ئاماژەی کرد کە لەشوێنی خۆتان بمێننەوە، ڕۆشت خۆی شت، پاشان کە هاتەوە ئاو لەسەری دەتکا، جا سەرلەنوێ نوێژی دابەستەوەو بەرنوێژی بۆکردن.

٢٣٤ ـ له حماد بن سلمة ـەوه بەهەمان سەنەد و مانا هاتووە، کە ووتویەتی : لەسەرەتاوە (الله أكبر) ـی کردو نوێژی دابەست، هەروەها لە کۆتایی فەرموودەکەوە ووتی : کاتێ کە سڵاوی نوێژەکەی دایەوە، فەرمووی : منیش مرۆڤێکم وەك ئێوە و وە لەشگران بووم.

أبو داود دەڵێت : له أبو هريرة ـەوه دەگێڕنەوە، کە ووتویەتی : کاتێ کە لە جێگا نوێژەکەیدا هەستا ئێمە چاوەڕوانی ئەومان دەکرد کە نوێژ دابەستێت کەچی ڕۆشت پاشان فەرمووی : وەك خۆتان بمێننەوە.

*چەند فەرموودەیەکی تر هاتووە بۆ درێژبوونەبوونەوە نەم نوسی ئەتوانن بگەڕێنەوە بۆ سنن ـی ابو داود

## | باسی کەسێ کاتێ لەخەو هەستا هەست بە تەڕایی تۆماو بکات |

٢٣٦ ـ لە دایکە عائشة ـ رضي الله عنها ـ هاتووە، کە ووتویەتی : لە رسول الله ـیان ـ صلى الله عليه وسلم ـ پرسی : ئەگەر پیاوێ تەڕایی هەست پێ کرد، بەڵام نەیەتەوە یادی کە احتلام بووە، ئایا خۆی بشوات یان نا؟ رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرمووی : با خۆی بشوات.

لێیان پرسی : ئەگەر پیاوێ وای دەزانی کە توشی احتلام بووە، بەڵام تەڕایی مەنی هەست پێ نەکرد، ئایا خۆی بشوات یان نا؟
رسول الله ـ صلی الله علیه وسلم ـ فەرمووی : خۆشوشتنی لەسەر نییە.
ام سلیم ووتی : ئافرەتیش هەست بەو تەڕاییە دەکات ئایا خۆشوشتنی لەسەرە یان نا؟
رسول الله ـ صلی الله علیه وسلم ـ فەرمووی : بەڵێ، بێگومان ئافرەتان هاوشێوەیی پیاوانن.

٢٣٧ ـ لە دایکە عائشة ـوە ـ رضي الله عنها ـ هاتووە، کە ووتویەتی : ام سلیم ئەنصاری (کە دەکاتە دایکی أنس بن مالك) ووتی : ئەی رسول الله ـ صلی الله علیه وسلم ـ الله تعالی لە توونی قسەی ڕەوا شەرم ناکات، ئەگەر ئافرەت هەستا لە خەو ئەوەی هەست پێ کرد کە پیاو هەستی پێ دەکات، ئایا خۆشوشتنی لەسەرە یان نا؟
دایکە عائشە ووتی : رسول الله ـ صلی الله علیه وسلم ـ فەرمووی : بەڵێ، خۆشوشتنی لەسەرە ئەگەر تەڕایی هەست پێ کرد.
دایکە عائشە ووتی : ڕووم تێکردو ووتم : ئۆف لەدەستی تۆ ئایا ئافرەت ئەوە دەبینێ واتە احتلام دەبێ؟
رسول الله ـ صلی الله علیه وسلم ـ ڕووی تێ کردم و فەرمووی : ئەی عائشە دەستت لەخاك بدات، ئەی ئەگەر احتلام نابێ و ئاوی نایەتەوە بەچی منداڵەکەی لەخۆی دەچێ.

## | باسی ئەندازەی ئەو ئاوەی کە بەسە بۆ خۆشوشتن |

٢٣٨ ـ لە دایکە عائشة ـوە ـ رضي الله عنها ـ هاتووە، کاتێ کە رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ لەشگران بوایە لەدەفرێکدا خۆی دەشت کە(فَرَق) یان پێ دەوت.

أبو داود دەڵێت : ئەم فەرموودە لە زهری ـەوە هاتووە، کە دایکە عائشە ووتویەتی : جاران من و رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ بەیەکەوە لە دەفرێکدا خۆمان دەشت بە ئەندازەی فەرەقێ ئاوی دەگرت(فەرقیش شانزە رطل ـە).

أبو داود دەڵێت : ابن عيينة بە هەمان شێوە فەرمودەکەی مالیکی گێڕاوەتەوە.

ابو داود دەڵێت : لە أحمد بن حنبل ـم بیستووە دەی ووت : فەرەق شانزە ڕەتڵە، هەروەها گوێم لێی بوو ووتی : صاعی ابن أبی ذئب پێنج ڕەتڵ و سێیەکە ڕەتڵێکە، ووتی ئەوەی دەڵێ : هەشت ڕەتڵە ئەوە لەلایەن فەرمودەناسانەوە نەبیستراوە بۆیە لەبەرنەکراوە.

## | باسی چۆنیەتی خۆشوشتن لە لەشگرانی (الجنابة) |

٢٤٢ ـ لە دایکە عائشة ـوە ـ رضي الله عنها ـ هاتووە، کە ووتویەتی : رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ کاتێ بیویستایە بۆ جنابەت لەشگرانی خۆی بشوات، سلیمان ووتی : بەدەستی ڕاستی ئاوی دەکرد بە دەستی چەپیدا، مسدد هەماهەنگن ووتیان : شەرمگەی دەشت، مسدد ووتی : بەدەستی ڕاستی ئاوی دەکرد بەدەستی چەپیدا، دایکە عائشە ـ رضي الله عنها ـ هەندێ جار بە کینایە باسی شەرمگەی دەکرد، ئەوجا دەستنوێژی دەگرت وەك چۆن بۆ نوێژکردن دەستنوێژی دەگرت، پاشان هەردوو دەستی دەکرد بەناو ئاوەکەدا و دەیکرد بەسەریدا پەنجەکانی دەکرد بە ناو

مووەکانی سەریدا، هەتا دەیبینی ئاو گەیشتۆتە ژێر مووەکانی و پێستی سەری تەڕ بووە(یان پاك بۆتەوە) ئەوکاتە سێ مشت ئاوی هەڵدەگرت و دەیکرد بە سەریدا، ئەگەر ئاو بمایەتەوە دەیکرد بەجەستەیدا.

تێبینی / [بۆ زانیاری زیاتر سەیری سنن ی ابو داود بکەن]

## | ئاو ڕادان لە دەم و لوت لەکاتی خۆشۆردنی جەنابەت و دەستنوێژدا |

ابن منذر دەڵێت : زانایان جیاوازن لەسەر استنشاق و مضمضە (ئاوڕادان لە دەم و لوت) لە جەنابەت و دەستنوێژدا

هەندێک دەڵێن : گەر لە لەستنوێژ وازی لێهێنا دەبێت دەستنوێژ بگرێتەوە ئەمەش ڕای (عطاء و حماد و ابن ابی لیلی و زوهری و اسحاق بن راهویە) یە.

هەندێکی تر دەڵێن : لەسەری نیە دەستنوێژ بگرێتەوە، ئەمەش ڕای (حەسەنی بەصریە و عطاء) بۆ ئەم قەولە گەڕاوەتەوە، وە (حەکەم و قەتادە و زوهری و ڕەبیعە و یەحیی ی ئەنصاری و مالك و شافعی و لیث و ئەوزاعی) وادەڵێن.

هەندێکی تر دەڵێن : ئاو ڕادان لە لوت دەگێڕنەوە گەر وازی لێهێنا بەڵام ئاو کردنە دەم گەر نەیکرد نایگێڕێتەوە، ئەمەش وتەی (أحمدو ابو عبید و ابو ثورە).

هەندێکیش دەڵێن لە جەنابەت لەسەری واجبە و لە دەستنوێژ واجب نیە.
ئەمەش ڕای (حەسەن و سوفیان و ئەهلی ڕەئیە
الأوسط لإبن منذر).

اسحاق دەڵێت : وتم بە ئیمامی أحمد دەربارەی ئاو ڕادان لەدەم و لوت گەر بیر چوو؟

احمد فەرمووی : دەبێ نوێژەکە و ئاو کردنە لوت بگرێتەوە، بەڵام بۆ ئاو ڕادان لە دەم ئاسایی ترە.

[مسائل الكوسج (٢/٢٧٥)].

حرب دەڵێت : پرسیم لە أحمد ئایا گەر پیاوێ ئاو ڕادانی بیرچوو لە دەم و لوت وە نوێژی کرد نوێژەکەی دەگێڕێتەوە؟ وە دەستنوێژ دەگرێتەوە؟

فەرمووی : نەخێر بەڵکو ئاو ڕادەدات لە دەم و لوتی و نوێژەکەی دەکاتەوە.

[مسائل الحرب (٢٢٦)]

أبو داود دەڵێت : لێم پرسی (واتە لە ئیمام أحمد) ئایا ئاو ڕادان لە دەم و لوت فەرضە؟
فەرمووی : ناڵێم فەرضە جگە لەوەی لە قورئان هاتوە.
بەلەفضی صریح استنشاق و مضمضە نەهاتوە
بەڵکو ئەوانەی پێیان واجبە حەملیان کردوەتە سەر وجوهکم لە ئایەتەکە دەڵێن ئەوانیش بەشێکن لەوجوە.

[مسائل أبي داود (١٣)]

٨٤ - گوێم لە باوکم بوو ( ئیمامی أحمد) پرسیاری لێکرا دەربارەی پیاوێك بیری چوە ئاو ڕادا لەدەمی و بیکاتە لوتی وە نوێژی کردوە؟
فەرمووی : نوێژەکەی دەگێڕێتەوە
ووترا : دەست نوێژ دەرێتەوە؟
فەرمووی : نەخێر تەنها ئاوڕادان لە دەم و لوتی دەگێڕێتەوە.

[مسائل الإمام أحمد رواية ابنه عبد الله]

شەعبی دەڵێت : گەر لە جەنابەت بیری چوو دەبێ بیکاتەوە، بەڵام لەدەستنوێژ بیری چووو کێشەی نیە.
[مصنف ابن أبي شيبة (١/١٧٩)]

ڕەبیعەی کوڕی عبدالرحمن دەڵێت : گەر ئاو ڕادان لە لوت و دەمی بیرچوو بەشێك نیە لەدەست نوێژ.

ابن وهب و لیث و ابن سعید دەڵێن : گەر ئاوڕادان لە دەم و لوتی بیرچوو تاوەکوو نوێژەکەی دەکات، پێی ناوترێت نوێژەکەت بگێڕەوە، وە ئێمە وای نابینین ئەمە لە نوێژەکەی کەم کاتەوە.

ابن وهب دەڵێت : ابن شهاب و عطاء و عبیدالله ی کوڕی عەمر دەڵێن : دەستنوێژ ناگیرێتەوە جگەلەوەی الله لە کتابەکەی باسی کردوە.

ابن وهب دەڵێت : مالك و لیثی کوڕی سەعید هەمان شتیان وتوە.

[المدونة (١/١٢٣)]

هەندێك لە زانایان دەڵێن : استنشاق (ئاو کردنە لوت) واجبە لە دەست نوێژ و خۆشۆردندا بەڵام ئاوڕادان لە دەم واجب نیە لە هیچ یەکێك لەو دوانەدا. ئەمەش ڕای (أحمد بن حنبل و أبو ثور و کۆمەڵێك لە هاوەڵانی حەدیثە) لەبەر حەدیثەکە کە رسول الله فەرمووی : گەر دەست نوێژت گرت ئاو بکە لوتت پاشان دەریکە

[اختلاف الفقهاء للمروزي (١/٩٩)]

## | سەربڕاوی دەستی کەسی لەش گران (جەنابەت) |

إسحاق بن منصور دەڵێت : ووتم بە ئیمام أحمد ئایا کەسی لەش گران سەردەبڕێت؟
ئیمام ووتی : هیچ کێشەی تێدانیە.

[مسائل الكوسج (٢٧٩١)]

ابن القطان الفاسي دەڵێت : بە ئیجماع سەربڕاوی دەستی لەش گران یان ئەو ئافرەتەی لە حەیض دایە دەخورێت.

[الإقناع في مسائل الإجماع (١٧١٣)]

ابن المنذر دەڵێت : سەربڕاوی کەسی لەش گران وەك کەسێکە کە لەسەر خاوێنییە وە ئەوەشی ڕوخسەتی داوە ئەم ئیمامانەن ڕەحمەتی الله یان لێبێت (حسن البصري و الحكم و أحمد بن حنبل و إسحاق بن راهويه و ليث بن سعد و ابي ثور ) وە هیچ یەکێکم نەزانیوە ڕێگری لەوە بکات وە ئافرەتی حەیض دار هەمان شتە.

[الإشراف لابن المنذر (١٧١٢)]

## دەروازەیی نـــــوێـــــەم

**| ئافرەتێك داخڵی كاتی نوێژێك دەبێت بەڵام دوای دەخات و نایكات لە كاتی خۆیدا لە پڕ حەیضی بەسەردا دێت ، ئایا چی بكات لەم كاتەدا كە نوێژەكەی نەكردووە و حەیضی بەسەر هاتووە ؟ |**

ابن أبي شيبة لە مصنف بابێکی داناوە لەسەر ئەم بابەتە بەناوی :
[(١٩) في المراة يدخل عليها وقت صلاة فلا تصليها حتى تحيض]

واتە: لە بارەی ئافرەتێك داخڵی كاتی نوێژ دەبێت و نوێژ ناكات هەتا حەیضی بەسەردا دێت .

شەعبی دەڵێت : ئەگەر كاتی نوێژكردن هات بەسەر ئافرەتێكدا و نوێژی نەكرد هەتا حەیضی بەسەردا هات وە ئەو لە كاتی نوێژدایە، ئەو نوێژە قەزا ئەكاتەوە ئەگەر پاك بوویەوە لە حەیض .

٧٣١٠- حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ عَيَّاشٍ، عَنِ مُغِيرَةَ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، قَالَ:
إذَا دَخَلَ وَقْتُ صَلاَةٍ عَلَى الْمَرْأَةِ فَلَمْ تُصَلِّ حَتَّى حَاضَتْ وَهِيَ فِي وَقْتِ صَلاَةٍ قَضَتْهَا إذَا طَهُرَتْ.

شەعبی دەڵێت : ئەگەر داخڵی كاتی نوێژ بوو وە ئافرەتێك حەیضی بەسەردا هات پێش ئەوەی كە نوێژەكەی بكات نوێژەكەی دەكات كاتێك پاك بوویەوە لە حەیض .

٧٣١١- حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ ابْنِ شُبْرُمَةَ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، قَالَ:
إذَا دَخَلَ وَقْتُ الصَّلاَةِ فَحَاضَتِ الْمَرْأَةُ قَبْلَ أَنْ تُصَلِّيَ فَلْتُصَلِّهَا حِينَ تَطْهُرَ.

عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ إِيَاسٍ دەگێڕێتەوە لە إبراهيم النخعي پرسیاری لێ کرا دەربارەی ئافرەتێك داخڵی کاتی نوێژ دەبێت و دوای دەخات هەتا تووشی حەیض دەبێت ؟

ووتی : دەست بە نوێژ دەکات ئەگەر پاك بوویەوە (واتە ئەو نوێژە قەزا ئەکاتەوە ، و الله اعلم).

٧٣١٢- حَدَّثَنَا أَبُو خَالِدٍ الأَحْمَرِ، عَنْ حَجَّاجٍ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ إِيَاسٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: سَأَلْتُهُ، عَنِ امْرَأَةٍ دَخَلَتْ فِي وَقْتِ صَلاَةٍ فَأَخَّرَتْهَا حَتَّى حَاضَتْ، قَالَ: تَبْدَأُ بِهَا إِذَا طَهُرَتْ.

حەسەن و محمد دەڵێن : ئەگەر تووشی حەیض بوو لە کاتی نوێژدا ئەوە قەزا کردنەوەی نوێژی لەسەر نیە ئیللا مەگەر کە کاتەکەی ڕۆشتبێت و نەمابێت ( مەبەستی ئەوەیە گەر لە کاتی نوێژەکە تێنەپەڕیبوو ئەوا قەزا کردنەوەی لەسەر نیە چونکە حەیضی بەسەر هاتووە ، بەڵام گەر تێپەڕیبوو ئەوە دەبێ دواتر ئەو نوێژە قەزا بکاتەوە چونکە کاتێکی نوێژی بە فیڕۆ داوە ، و الله اعلم ).

٧٣١٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي عَدِيٍّ، عَنْ أَشْعَثَ، عَنِ الْحَسَنِ وَمُحَمَّدٍ، قَالاَ: إِذَا حَاضَتْ فِي وَقْتِ صَلاَةٍ فَلَيْسَ عَلَيْهَا قَضَاءُ تِلْكَ الصَّلاَةَ إِلاَّ أَنْ يَكُونَ الْوَقْتُ قَدْ ذَهَبَ.

حەماد دەڵێت : قەزا کردنەوەی لەسەر نیە لەبەر ئەوەی لە کاتی خۆیدایە نوێژ .

٧٣١٤- حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ عَيَّاشٍ، عَنْ مُغِيرَةَ، عَنْ حَمَّادٍ، قَالَ لَيْسَ عَلَيْهَا قَضَاؤُهَا لأَنَّهَا فِي وَقْتٍ.

[مصنف ابن أبي شيبة].

ابن هانئ دەڵێت : پرسیم لە ئیمام أحمد دەربارەی ئافرەتێك داخڵی کاتی نوێژ دەبێت و لە حاڵەتی پاکیدایە، نوێژەکەی دوا دەخات لە کاتی خۆی بە کەمێك پێش ڕۆشتنی کاتەکەی هەتا تووشی حەیض دەبێت؟

ئیمام أحمد دەڵێت : نوێژەکەی دەکاتەوە (واتە کە پاك بوویەوە ئەو نوێژە قەزا ئەکاتەوە ، واللە اعلم ).

قال ابن هانئ : سألته عن المرأة يدخل وقت الصلاة وهي طاهر ، فأخرت الصلاة عن وقتها بقليل حتى حاضت ؟

قال : تصليها .

[مسائل الإمام أحمد برواه ابن هانئ ( ١٥٣)]

// تێبینی : بابەتێکە جێگای جیاوازیە ئەو ئافرەتانەی تووشی ئەو حاڵەتە دەبن دواتر کە پاك بوونەوە ئەو نوێژە قەزا بکەنەوە چونکە لەو کاتە نەتان کردووە و دواتان خستووە تا تووشی ئەو حاڵەتە بوون بۆیە نوێژەکە قەزا بکەنەوە چاکرە تەنها باسی یەك نوێژە کە نەتکردووە و دوات خستووە تا تووشی حەیض بوویت باسی هەموو نوێژەکان نیە لەو کاتەی لە حەدیض دایت چونکە هیچ نوێژێك لەو ماوەیە ناگێڕیتەوە ، واللە اعلم .

# دەروازەیی دەیـــــەم

## | دەربارەی گێڕانەوەی نوێژ لە ماوەی حیض دا |

ئایا ئەو ئافرەتانەی کە تووشی حەیض دەبن هەیە ماوەی حەوت ڕۆژ یان کەمتر و زیاتر پێویست دەکات لەو ماوەیەدا کە نابێ نوێژ بکەن دواتر نوێژەکانی ئەو ماوەیەی کە لە حەیض دا بوون بیگێڕنەوە؟

وەڵام : نەخێر پێویست ناکات هیچ نوێژێك بگێڕنەوە کە لە ماوەی حەیض دا نەیان کردووە، وە گێڕانەوەی دروست نیەو بیدعەیە .

عبدالرزاق لە مصنف ـەکەیدا بابێکی داناوە بەناوی :
[(١٨) باب قضاء الحائض الصلاة]

واتە : قەزاکردنەوەی نوێژ بۆ ئافرەتانی حەیض دار .

١٢٧٥- أَخْبَرَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ، عَنْ عَطَاءٍ، قَالَ: قُلْتُ لَهُ: أَتَقْضِي الْحَائِضُ الصَّلاَةَ؟ قَالَ: لاَ، ذَلِكَ بِدْعَةٌ.

ابْنُ جُرَيْجٍ دەگێرێتەوە لە عَطَاءٍ دەڵێت : پێم ووت : ئایا ئافرەتی حەیض دار نوێژەکانی قەزا دەکاتەوە؟
ووتی : نەخێر، ئەوە بیدعەیە .

١٢٧٦- عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، قَالَ: سُئِلَ أَتَقْضِي الْحَائِضُ الصَّلاَةَ؟ قَالَ: لاَ، ذَلِكَ بِدْعَةٌ.

پرسیار کرا لە عِكْرِمَةَ ئایا ئافرەتی حەیض دار نوێژەکانی قەزا دەکاتەوە؟
ووتی : نەخێر، ئەوە بیدعەیە .

١٢٧٧- عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ عَاصِمٍ الأَحْوَلِ، عَنْ مُعَاذَةَ الْعَدَوِيَّةِ قَالَتْ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ، فَقُلْتُ: مَا بَالُ الْحَائِضِ تَقْضِي الصَّوْمَ وَلاَ تَقْضِي الصَّلاَةَ؟ فَقَالَتْ: أَحَرُورِيَّةٌ أَنْتِ؟ قُلْتُ: لَسْتُ بِحَرُورِيَّةٍ، وَلَكِنِّي أَسْأَلُ قَالَتْ: قَدْ كَانَ يُصِيبُنَا ذَلِكَ مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَنُؤْمَرُ بِقَضَاءِ الصَّوْمِ، وَلاَ نُؤْمَرُ بِقَضَاءِ الصَّلاَةِ.

مُعَاذَةَ الْعَدَوِيَّةِ دەڵێت : پرسیم لە دایکە عَائِشَةَ ـ رَضِيَ اللهُ عَنْها ـ ، پێم ووت : ئەوە چیە ئافرەتی حەیض دار ڕۆژووەکانی قەزا دەکاتەوە و نوێژەکانی قەزا ناکاتەوە؟
دایە عَائِشَةَ ـ رَضِيَ اللهُ عَنْها ـ فەرمووی : تۆ حەروریەیت؟
ووتم : حەروریە نیم، بەڵام پرسیار دەکەم ، فەرمووی : کاتێك ئێمە تووشی حەیض دەبووین لەگەڵ پێغەمبەری الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرمانی پێ دەکردین بە قەزا کردنەوەی ڕۆژووەکەمان، وە فەرمانی پێنەدەکردین بە قەزاکردنەوەی نوێژەکەمان .

١٢٧٩- عَنِ الثَّوْرِيِّ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمْ يَأْمُرِ امْرَأَةً مِنَّا أَنْ تَقْضِيَ الصَّلاَةَ.

دایە عَائِشَةَ ـ رَضِي عَنْها ـ دەفەرموێت : ئێمە لای پێغەمبەری الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ بووین فەرمانی نەدەکرد بە هیچ ئافرەتێك لە ئێمە کە نوێژەکانمان قەزا بکەینەوە .

١٢٨٠- عَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، قَالَ: الْحَائِضُ تَقْضِي الصَّوْمَ، قُلْتُ: عَمَّنْ؟ قَالَ: هَذَا مَا اجْتَمَعَ النَّاسُ عَلَيْهِ وَلَيْسَ فِي كُلِّ شَيْءٍ نَجِدُ الإِسْنَادَ.

مَعْمَرٍ دەگێڕێتەوە لە الزُّهْرِيِّ کە ووتویەتی : ئافرەتی حەیض دار ڕۆژووەکەی قەزا دەکاتەوە، مَعْمَرٍ دەڵێت : ووتم : کێ وای وتووە ؟
ووتی : ئەمە ئەو شتەیە کە خەڵك لەسەری ڕێککەوتوون، لە هەموو شتێکدا سەنەد نابینینەوە .
[مصنف عبدالرزاق]

## | باسی ئافرەتی بێ نوێژ نوێژە فەوتاوەکانی ناگێڕێتەوە |

٢٦٢ ـ لە معاذة ـوە هاتووە، کە ئافرەتێ پرسیاری کرد لە دایکە عائشة ـ رضي الله عنها ـ ووتی : ئایا ئافرەتی بێ نوێژ نوێژە فەوتاوەکانی دەگێڕێتەوە؟
دایکە عائشة ـ رضي الله عنها ـ ووتی : بۆچی تۆ (حروریە)یت؟(حروریەکان کۆمەڵەیەکن لە خەواریجەکان تاقمێکی گومڕان)، ئێمە لەگەڵ رسول الله ـدا بووین ـ صلى الله علیه وسلم ـ کاتێ کە بێ نوێژ دەبووین نە نوێژە فەوتاوەکانمان دەگێڕایەوە وە نە فەرمانیشمان پێ دەکرا بە گێڕانەوەیان.

أبو داود دەڵێت : بەڵام ئەمەی بۆ زیاد کردووە : فەرمانمان پێ دەکرا بۆ گێڕانەوەی ڕۆژووە فەوتاوەکان، بەڵام فەرمانمان پێ نەکراوە بە گێڕانەوەی نوێژە فەوتاوەکان.

// تێبینی : ئافرەت لە کاتی حەیض دا هیچ نوێژێك ناگێڕێتەوە هەتا پاك دەبێتەوە، ئەوانەی دەڵێن دەیگێڕێتەوە حەروریەکانن کە بەشێکن لە خەواریج پێیان وایە ئافرەت ئەبێ هەموو نوێژەکانی بگێڕێتەوە کە لە کەتی حەیض ـدا نەیکردووە جا ئەمە بیدعەیەو دروست نیە، بەڵام ئافرەتان دوای تەواو بوونی کاتی حەیض ڕۆژووەکانیان دەگێڕنەوە بە پێچەوانەی نوێژەوە، والله اعلم .

# دەروازەیی یـــــانزە

## | باسی نان خواردن لەگەڵ ئافرەتی بێ نوێژ و تێکەڵاوی کردنی |

٢٥٨ ـ لە انس بن مالك ـ رضي الله عنه ـ دەگێڕنەوە، کە جولەکە هەر کاتێ ئافرەتێکیان بکەوتایەتە بێ نوێژیەوە، لە ماڵ دەریان دەکرد، نە خواردن و خواردنەوەیان لەگەڵی دەخوارد، نە لە ماڵیشەوە لەگەڵی دادەنیشتن، بەڵکو پارێزیان لێ دەکردوو جێیان بۆ جیادەکردەوە، بۆیە هاوەڵانی رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ لەوبارەیەوە لێیان پرسی؟
الله عز وجل ئەم ئایەتەی بۆ دابەزاند {وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَاعتَزِلُوا النِّسَاءَ فِي الْمَحِيضِ}
واتە : وە پرسیارت لێ دەکەن دەربارەیی بێ نوێژی بڵێ بێ نوێژی ئازارە، کەواتە دووربکەونەوە لە هاوسەرەکانتان لەکاتی بێ نوێژیدا، هەتا کۆتای ئایەتەکە، ئەوجا رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرمووی : لە ماڵەکاندا لەگەڵیان کۆببنەوەو هەموو شتێکیان لەگەڵ ئەنجام بدەن جگە لە کاری سەرجێی (جماع) نەبێت،
جولەکە ووتیان : ئەم پیاوە دەیەوێت لە هەموو یاسایەکی ئێمەدا دژی ئێمە بوەستێ، جا أُسيد بن حضير و عباد بن بشر چونە خزمەتت رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ ئەم باسەیان بۆ گێڕایەوە و ووتیان : ئەی رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ جولەکە ئاواو ئاوا دەڵێن، ئەی بۆچی ڕێگامان پێ نادەیی هەتا لەکاتی بێ نوێژیدا بچینە لایان و دروست ببین لەگەڵیانا؟
رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ ڕووی گرژ کردوو ڕەنگی گۆڕا، هەتا وامان دەزانی کە لێیان تورە بووە، بۆیە هەردووکیان هەستان چوونە دەرەوە و ڕۆشتن، لەپاشن هەندێ شیریان بەدیاری هێنا بۆ رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ ئەویش لەو شیرەی نارد بۆیان و خواردیانەوە و تێگەیشتن کە دڵی لێیان نەیاشەوە.

٢٥٩ ـ لە عائشة ـوە ـ رضي الله عنها ـ هاتووە، کە ووتویەتی : ئێسقانم دەکرِاندەوە لە کاتێکدا کە بێ نوێژ بووم، پاشان ئێسقانەکەم دەدایە دەست

ڕسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ ئەویش دەمی لە جێگەی دەمی من دادەنا، ئاوم دەخواردەوە لە کاتێکدا کە بێ نوێژبووم، دوای ئەوە قاپەکەم دەدایە دەست ڕسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ ئەویش دەمی لە جێگەی دەمی من دادەناو ئاوی دەخواردەوە.
ئەمەش بەڵگەیە لەسەر تێکەڵاوی کردنی ئافرەتی بێ نوێژ و پاکێتی بەرماوەیان.

٢٦٠ ـ لە دایکە عائشة ـوە ـ رضي الله عنه ـ هاتووە، کە ووتویەتی : ڕسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ سەری خستە سەر کۆشم و قورئانی دەخوێند، لە کاتێکدا کە من بێ نوێژبووم.

٢٦١ ـ لە دایکە عائشة ـوە ـ رضي الله عنها ـ هاتووە، کە ووتویەتی : لە ماڵەکەی خۆمدا بووم ڕسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ لەناو مزگەوتدا بوو پێی فەرمووم : خُمْرَة ـکەم بدەرێ، (خُمْرَة بەرماڵێکی بچوك بوو لە پەلکە خورما دروست دەکرا)،
ووتم : من بێ نوێژم بۆیە ناتوانم دەست درێژبکەم بۆ ناو مزگەوت،
ڕسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرمووی : خۆ خوێنی بێ نوێژیەکەت لە ناو دەستتدا نییە.

## | ئایا ئافرەتی الحائض (واتە ئەوەی لە سوڕی مانگانەدایە)دەستنوێژ بشۆرێت لە کاتی نوێژەکاندا؟ |

١٠١٣ - لە یحیی بن أیوب گێڕدراوەتەوە، ووتویەتی : گوێم لە حکم بن عتیبة بوو دەی ووت : مامۆستاکانم دەربارەی ئافرەتی حەیض دار پێیان باش بوو کە دەستنوێژ بشۆرێت وەك دەستنوێژ شۆردنی بۆ نوێژ، دوواتر (سبحان الله و الله أكبر)بکات لەکاتی نوێژدا.

١٠١٦ - لە عطاء ـوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی ئافرەتی حیض دار کە ئایا قورئان بخوێنێت؟
ووتویەتی : نەخێر، تەنها بەشێکی ئایەت نەبێت(واتە بەشێکی کەمی ئایەت بخوێنێت)، بەڵکو دەستنوێژ دەشۆرێت لە کاتی هەموو نوێژێکدا، دواتر ڕوودەکاتە قیبلە و(سبحان الله و الله أكبر) و دووعا وبزا دەکات.

١٠١٧ - لە مکحول ـوە گێڕدراوەتەوە، ووتویەتی : فەرمان بە ئافرەتی حیض دار دەکرێت دەستنوێژ بشۆرێت لە کاتی نوێژدا، هەروەها ڕوو بکاتە قیبلە و یادی الله بکات.

[سنن الدارمي / إسناد صحيح].

## | باسی چێژ وەرگرتن لە ئافرەتی بێ نوێژ جگە لە نێوان ناوك و ئەژنۆی |

٢٦٧ ـ لە میمونة ـوە هاتووە، کە ووتویەتی رسول الله ـ صلی الله علیه وسلم ـ لەگەڵ یەکێ لە خێزانەکانی خۆی کە بێ نوێژ بووایە گەمەی لەگەڵ دەکرد و چێژی لێ وەردەگرت، ئەگەر نێوان ئەژنۆ و ناوکی بە پۆشاکێ داپۆشراو بووایە.

٢٦٨ ـ لە دایکە عائشة ـوە ـ رضي الله عنها ـ هاتووە، کە رسول الله ـ صلی الله علیه وسلم ـ ئەگەر یەکێ لە ئێمە بێ نوێژ بوایە فەرمانی پێ دەکرد کە نێوان ئەژنۆ و ناوکی بە پۆشاکێ داپۆشێت، پاشان گەمەی لەگەڵ دەکردو چێژی لێ وەردەگرت.

٢٧٣ ـ لە دایکە عائشة ـوە ـ رضي الله عنها ـ هاتووە، کە ووتویەتی : رسول الله ـ صلی الله علیه وسلم ـ لەکاتی بێ نوێژیدا فەرمانی پێ دەکردین بەوەی کە نێوان ئەژنۆ و ناوکمان بە باشی داپۆشین، ئەوجا گەمەیی لەگەڵ دەکردین و چێژی لێ وەردەگرتین، ئایا کەمتان دەتوانن خۆتان بگرن، وەکو رسول الله ـ صلی الله علیه وسلم ـ خۆی دەگرت.

## | باسی چۆنیەتی خۆشوشتن لەدوای پاك بوونەوە لە بێ نوێژی |

٣١٥ ـ لە دایکە عائشة ـوە دەگێڕنەوە، کە ووتویەتی أسماء هاتە ژوورەوە بۆ لای رسول الله ـ صلی الله علیه وسلم ـ ووتی : ئەی رسول الله ـ صلی الله علیه وسلم ـ ئەگەر یەکێ لە ئێمە پاك بوویەوە لە بێ نوێژی چۆن خۆی بشوات؟

فەرمووی : لە پێشدا مۆرد و ئاوەکەی ئامادەبکاو خۆی پێ پاك بکاتەوە و تارەتێکی جوان بگرێت، ئەوجا دەستنوێژ بگرێت، پاشان ئاو بکا بەسەریداو دەستی تێبخات هەتا ئاو دەگاتە بنی مووەکانی و تەڕدەبێت، پاشان ئاو بکات بە جەستەیدا، ئەوجا پارچە لۆکەیەکی میسکاوی بێنێ خۆیی پێ پاك بکاتەوە و تارەتی پێ بگرێت،

أسماء ووتی : ئەی رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ چۆن چۆنی خۆمی پێ پاك بكەمەوە و تارەتی پێ بگرم؟
دایکە عائشة ـ رضي الله عنها ـ ووتی : زانیم کە رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ بەکینایەوە پێی دەڵێ و ئەویش تێ ناگات بۆیە پێم ووت : بیهێنە بە شوێنی خوێنەکەدا، بۆ ئەوەی شوێنەکەی پاك کاتەوە بۆنەکەی ببڕێت.

## | باسی تەیەمموم کرنی لەشگران |

٣٣٢ ـ لە أبي ذر ـوە هاتووە، کە ووتویەتی : مەڕەکانم کۆکردەوە لەلای رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرمووی : ئەی أبا ذر دەریان بکەو بیان بە بۆ لەوەڕگایە، منیش بردنم بۆ ربدة (دێیەکە لە نزیك مەدینە) توشی لەشگرانی بووم، پێنج تا شەش ڕۆژ مامەوە بە لەشگرانیەوە نوێژم دەکرد، کاتێ کە هاتمەوە بۆ لای رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرمووی : ئەی أبو ذر، منیش بێدەنگ بووم،
فەرمووی : ئەی أبا ذر دایکت ڕۆڵەڕۆت بۆبکات و هاوار بۆ دایکت، جا کەنیزەکێکی ڕەشی بانگ کرد ئەویش بە تەشتێکی گەورەوە کە ئاوی تێدابوو هات،
رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ لە لایەکەوە بە پۆشاکێ پەردەی بۆ کردم، منیش لە لایەکی ترەوە وڵاخەکەم کرد بە پەردە بۆ خۆم و خۆم شت، لەشەرماندا وام دەزانی کێوێ بە کۆڵمەوەیە،
رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرمووی : ئەگەر ئاو دەستنەکەوت گڵی پاك پاکۆکەرەوەیە بۆ دەستنوێژی موسڵمان با دە ساڵیشی پێ بچێت، بەڵام ئەگەر ئاوت دەستکەوت خۆت بشۆ و دەستنوێژبگرە، چونکە ئەوە چاکترە خێر و پاداشتی زۆرترە.

أبو داود دەڵێت : مەڕەکان هی خێر و سەدەقە بوون،
ئەبو داود دەڵێت : فەرموودەکەی عمرو تەواوترە.

## | باسی ئەگەر لەشگران ترسی سەرمای هەبوو، بۆیی هەیە تەیەمموم بکات؟ |

٣٣٤ ـ لە عمرو بن عاص ـەوە هاتووە، کە ووتویەتی : لە غەزای (ذات السلاسل) لە شەوێکی زۆر سارددا لەشم گران بوو، جا ترسام لەوەی کە ئەگەر خۆم بشۆرم تیابچم، بۆیە تەیەمموم کرد، پاشان بەرنوێژی نوێژی بەیانیم بۆ هاوەڵەکەم کرد، کاتێك کە لە غەزاکە گەڕاینەوە بەسەر هاتەکەیان بۆ رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ گێڕایەوە، جا ئەویش فەرمووی : ئەی عمرو بە لەشگرانیەوە نوێژت بە هاوەڵەکانت کرد؟
منیش پێم ڕاگەیاند کەچی ڕێگری لێکردم لەوەی کە خۆم نەشۆم و تەیەممومم کرد،
ووتم : ئەم فەرموودەیەی الله تعالى ـم یاد کەوتەوە کە فەرمووی : {وَلَا تَقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ إِنَّ اللهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيماً}
واتە : خۆتان مەکوژن بەڕاستی الله تعالى زۆر بە بەزەییە بەرامبەر بە ئێوە.
رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ پێکەنی و هیچی نەفەرموو.

## | باسی شوشتنی ئەو پۆشاکەی کە ئافرەت لە کاتی بێ نوێژیدا لەبەریان بووە |

٣٥٧ ـ لە معاذة ـەوە هاتووە، کە ووتویەتی : سەبارەت بە ئافرەتی بێ نوێژ ئەگەر خوێنی بێ نوێژیەکەی بەر پۆشاکەکەی بکەوێت لە دایکە عائشة ـم ـ رضي الله عنها ـ پرسی؟
ووتی : واجبە بیشوات ئەگەر شوێنەواری خوێنەکەی ما با بەشتێکی زەرد وەك زەعفەران ڕەنگەکەی بگۆڕێت، وە هەروەها ووتی : لەسەردەمی رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ سێ جار کەوتمە حاڵەتی بێ نوێژیەوە ئەو پۆشاکەی کە لەبەرمدا بوو خوێنی بەرنەکەوت بۆیە نەمشت و نوێژم پێوە دەکرد.

٣٥٨ ـ له مجاهد ـەوه ـ رضي الله عنه ـ هاتووه، كه ووتويەتی : دايكه عائشة ـ رضي الله عنها ـ ووتی : هەر يەكێ لە ئێمە (واته لە خێزانەكانی رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ تەنها يەك پۆشاكی هەبوو لەكاتی بێ نوێژيدا لەبەريان بوو، ئەگەر شتێك لە خوێنی بەركەوتايە تفی لێ دەدا پاشان دەيپرواند.

٣٦٤ ـ له دايكه عائشة ـەوه ـ رضي الله عنها ـ هاتووه، كه ووتويەتی : بێ گومان هەر يەكێ لە ئێمە پۆشاكێكی هەبوو لە ڕۆژانی بێ نوێژيدا لەبەريدا بوو پێيەوە تووشی لەشگرانيش دەهات، پاشان ئەگەر دڵۆپێ خوێنی پێوە بديايە تفی خۆی لێ دەداو بەسەری پەنجەكانی دەيپرواند و لايدەبرد.

٣٦٥ ـ له أبي هريرة ـەوه هاتووه، كه خەولەی كچی يەسار هاتە لای رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ ووتی : ئەی رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ من تەنها يەك جل وبەرگم هەيە، وه بەو جلەيشەوه تووشی بی نوێژی دەبم چی بكەم؟
رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرمووی : جا ئەگەر پاك بويتەوه شوێنی خوێنەكە بشۆ، پاشان نوێژی پێوەبكە.
خەولە ووتی : ئەی ئەگەر شوێنەواری هەر مايەوه؟
فەرمووی : تەنها ئەوەندەت بەسە كە شوێنی خوێنەكە بشۆيت، شوێنەواری هيچ زيانێكت پێ ناگەيەنێت.

## | باسی نوێژكردن بە پۆشاكێكەوە جيماعی پێوەكرابێت |

٣٦٦ ـ له معاوية بن أبي سفيان ـەوه دەگێڕنەوه، كه لە خوشكەكەی ئوم حەبيبەی خێزانی رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ پرسيوه : رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ بەو پۆشاكەی كە جيماعی پێوەدەكرد نوێژی كردووه؟
ووتی : ئەگەر پيسی پێوه نەديبێت.

[سنن أبو داود السجستاني]

## | دەربارەیی نزيك بونەوەی ڕۆژووەوان لە هاوسەرەکەی |

٧٩٧ ـ لە دايكە عائشة ـوە ـ رضي الله عنها ـ گێڕدراوەتەوە، ووتويەتی : رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ دەستەگەمەی دەكرد (لەگەڵ خێزانەكانی) لە كاتێكدا بە ڕۆژووبوو.

٧٩٨ ـ لە ڕێگایێکی تريشەوە گێڕدراوەتەوە لە دايكە عائشة ـوە ـ رضي الله عنها ـ ووەويەتی : رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ دەستەگەمەيی دەكرد(لەگەڵ خێزانەكانی) لە كاتێكدا بەڕۆژووبوو.

[ إسناد ـيان صحيحە، سنن الدارمي (لا : ٢٨٨)]

## | ئافرەتيی حيض ـدار دەتوانێت نوێژ بكات بە پۆشاكەكەی كە تيايدا تووشی حيض بووە؟ |

١٠٥٠ ـ لە دايكە عائشة ـوە ـ رضي الله عنها ـ گێڕدراوەتەوە، ووتويەتی: ئەگەر ئافرەت پاك بوويەوە لە سوڕی مانگانە با موراقەبەی ئەو جلەی بكات كە بەر پێستی دەكەوێت (با سەيری بكات ئەگەر پيسيەكی پێوەبوو) با ئەوەی لە پيسی بەری كەوتووە بيشۆرێت، دواتر نوێژی پێوەبكات.

١٠٥١ ـ لە دايكە عائشة ـوە ـ رضي الله عنها ـ گێڕدراوەتە، ووتويەتی : هەر يەك لە ئێمە جلێكی هەبوو تيايدا تووشی سوڕی مانگانە دەبوو، وە تيايدا تووشی جەنابەت دەبوو، جا دواتر (كە پاك دەبوويەوە سەيری دەكرد) دڵۆپە خوێنێكی حيض ـی دەبينی و بەليكی خۆيی هەڵی دەپشاوت (دەپروكاند).

١٠٥٣ ـ لە دايكە عائشة ـوە ـ رضي الله عنها ـ گێڕدراوەتەوە، ووتويەتی: ئەگەر ئافرەت خوێنی (لەخۆی) شۆرد و (ڕەنگەكەی بە تەواوی

لانەچوو، ئەوە با (ڕەنگی خوێنەکە) بگۆڕێت بە زەردایی (ڕووەکی)وەرس یان (بە سورباى) زەعفەڕان.

١٠٥٥ - لە جابر بن صبح ـوە گێردراوەتەوە، ووتویەتی : گوێم لە خلاس بن عمرو بوو ووتی : گوێم لە دایکە عائشة - رضي الله عنها - بوو دەی ووت : هەموو جار رسول الله - صلى الله عليه وسلم - لەگەڵ من دەبوو لەناو یەك پێچەر (یەك پەشتە ماڵ)، لە کاتێکدا من حیض ـدار بووم، جا ئەگەر شتێك (دڵۆپە خوێنێکی) منی بەر کەوتبا، ئەو شوێنەی دەشۆرد کە پیسیەکەی بەر کەوتووە، بۆ جگە لەو شوێنە تێنەدەپەڕی (شوێنی تری نەدەشۆرد)، وە نوێژیشی پێوە دەکرد و دواتر دەگەڕایەوە (بۆلام)، جا ئەگەر (دووبارە) لە منەوە شتێکی بەرکەوتبایەوە ئاوای دەکردەوە، شوێنەکەی دەشۆرد، بۆ هیچ شوێنیتر تێپەڕ نەدەبوو (زیاتری نەدەشۆرد)و نوێژیشی پێوە دەکرد.

١٠٦٠ - لە أسماء بنت أبي بكر - رضي الله عنها -، گێردراوەتەوە، ووتویەتی : گوێم لە ئافرەتێك بوو پرسیاری لە رسول الله - صلى الله عليه وسلم - کرد دەربارەیی جلەکەی ئەو کاتەی پاك دەبێتەوە لە سوڕی مانگانەکەی کە ئاخۆ چی لێبکات؟
رسول الله - صلى الله عليه وسلم - فەرمووی : ئەگەر خوێنت پێوە بینی ئەوە هەڵیکرێنە، دواتر بە ئاو هەڵی پشێوە (بیگوشە)، دواتر ئەوەیتری ئاو ڕشێن بکەو نوێژی پێوەبکە.

١٠٦١ - لە أم قيس - رضي الله عنها - گێردراوەتەوە، ووتویەتی : پرسیارم لە رسول الله - صلى الله عليه وسلم - کرد دەربارەی خوێنی حیض کە بە جل و بەرگەوە دەنوسێ؟
فەرمووی : بە ئاوی سیدر بیشۆرە(سیدر جۆرە گیایێك بوو لە جێگای صابوونی ئێستا بەکاریان دەهێنا بۆ شت پاك کردنەوە)، وە هەڵیکرێنە بە پارچە دارێك(پێش شۆردنەکە).

## | باسی حوکمی ئارەقەی کەسی جەنابەتدار و ئافرەتی حیض ـدار |

١٠٦٤ ـ لە عبد الله بن عثمان بن خثيم گێردراوەتەوە، ووتویەتی : پرسیارم لە سعيد بن جبير كرد دەربارەی (حوکمی) کەسی جەنابەتدار کە عەرەق دەکات لەناو جلێکدا، دواتریش هەر بە جلەکە دەیسڕێتەوە؟

ووتی : هیچی تیانییە(ئاساییە و پیس نیە).

١٠٦٥ ـ لە سعيد بن جبير ـ رضي الله عنه ـ گێردراوەتەوە، کە پێی وانەبووە عەرەق کردنی کەسی جەنابەتدار لە ناو جلێکدا هیچ کێشەیەکی هەبێت (پێی وانەبووە پیس بێتت).

١٠٦٦ ـ لە الشعبي گێردراوەتەوە کە پێی وانەبووە (عەرەق کردنی کەسی جەنابەتدار لە ناو جلێکدا) هیچ کێشەیەکی هەبێت.

١٠٦٨ ـ لە القاسم بن محمد ـدوە گێردراوەتەوە، کە دایکە عائشة ـ رضي الله عنها ـ پرسیاری لێ کراوە دەربارەی (حوکمی) پیاوێك کە جیماع لەگەڵ خێزانەکەیدا بکات، دواتر جل لەبەر بکات و تیایدا ئارەقە بکات؟
دایکما عائشة ـ رضي الله عنها ـ پێی وا نەبوو هیچ کێشەیەکی هەبێت.

١٠٧١ ـ لە إبراهيم ـەوە گێردراوەتەوە، دەربارەی ئافرەتی حیض ـدار کە ئارەقەبکات لەناو جلەکەیدا؟
ووتویەتی : ئەوەندەی بەسە کە بەئاو بیڕشێنێت.

١٠٧٢ ـ لە ابن عمر ـهوە ـ رضي الله عنهما ـ گێردراوەتەوە، کە هەموو جار عەرەقی دەکرد لە ناو جل و بەرگدا لە کاتێکدا جەنابەتدار بوو، دواتر نوێژی پێوە دەکرد.

[إسناد ـيان صحيحه، سنن الدارمي (لا : ٣٤٥ ، ٣٤٩)]

## دەروازەیی دوانـــزە

**| ئافرەتێك لە کاتی حەیض دایەو پێش خۆر ئاوا بوون یان پێش دەرکەوتنی فەجری بەرەبەیان پاك دەبێتەوە، کام نوێژانەی لەسەرە کە بیان کاتەوە؟ |**

وەڵامەکەی لای زانایان وەردەگرین :
عبدالرزاق لە مصنف بابێکی داناوە بەناوی :
[(١٩) باب صلاة الحائض]

واتە: نوێژی ئافرەتی حەیض دار .

١٢٨١- عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنْ عَطَاءٍ، وَمَعْمَرٍ، عَنِ ابْنِ طَاوُوسٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالاَ: إِذَا طَهُرَتِ الْحَائِضُ قَبْلَ اللَّيْلِ صَلَّتِ الْعَصْرَ وَالظُّهْرَ، وَإِذَا طَهُرَتْ قَبْلَ الْفَجْرِ صَلَّتْ بِالْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ.

ابْنِ طَاوُوسٍ دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە کە وتویەتی : ئەگەر ئافرەتی حەیض دار پاکبوویەوە پێش ئەوەی شەو دابێت نوێژی عەسر و نیوەڕۆ دەکات پێکەوە، وە ئەگەر پاکبوویەوە پێش فەجری بەرەبەیان نوێژی مەغریب و عیشا دەکات پێکەوە .

١٢٨٥- أَخْبَرَنَا، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، قَالَ: حُدِّثْتُ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ قَالَ: إِذَا طَهُرَتِ الْمَرْأَةُ قَبْلَ غُرُوبِ الشَّمْسِ صَلَّتْ صَلاَةَ النَّهَارِ كُلَّهَا، وَإِذَا طَهُرَتْ قَبْلَ طُلُوعِ الْفَجْرِ صَلَّتْ صَلاَةَ اللَّيْلِ كُلَّهَا.

عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ -رَضِيَ اللهُ عَنْهُ- دەڵێت : ئەگەر ئافرەتێك پاکبوویەوە پێش ئاوا بوونی خۆر هەموو نوێژەکانی ڕۆژ دەکات، وە ئەگەر پاکبوویەوە پێش دەرکەوتنی فەجر هەموو نوێژەکانی شەو دەکات .

١٢٨٦- عَنِ الثَّوْرِيِّ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ الْحَسَنِ قَالَ: إِذَا طَهُرَتْ فِي وَقْتِ الْعَصْرِ صَلَّتِ الْعَصْرَ وَلَمْ تُصَلِّ الظُّهْرَ.

حەسەن بەصری دەڵێت : ئەگەر پاكبوویەوە لە كاتی نوێژی عەسر نوێژی عەسر دەكات و نوێژی نیوەڕۆ ناكات .

١٢٨٧- عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ قَتَادَةَ، قَالَ: إِذَا طَهُرَتِ الْحَائِضُ فِي وَقْتِ صَلاَةٍ صَلَّتْ تِلْكَ الصَّلاَةَ، وَإِذَا لَمْ تَطْهُرْ فِي وَقْتِهَا لَمْ تُصَلِّ تِلْكَ الصَّلاَةَ.

قَتَادَةَ دەڵێت : ئەگەر ئافرەتی حەیض ـدار پاكبوویەوە لە كاتی نوێژدا(واتە كاتی نوێژێك و كاتەكەی مابێت) ئەو كات ئەو نوێژە دەكات، وە ئەگەر پاكنەبوویەوە لە كاتەكەیدا ئەو كات ئەو نوێژە ناكات (مادەم كاتەكەی ڕۆشتووەوە).

پرسیم لە أحمد بن حنبل وتم :ئافرەتێك پاك بووەوە لە سوری مانگانە پێش ئاوابوونی خۆر ؟
فەرمووی :(نوێژی نیوەڕۆ و عەسر دەكات )
وتم :ئەگەر پێش دەركەوتنی فجر - پێش نوێژی بەیانی - پاك بوەوە ؟
فەرمووی : نوێژی ئێوارە و عیشا دەكات

وە بیستم لە اسحاق بن راهویە - دەیفەرموو : ئەوەی ئێمە پێمان وایە ، وە زۆربەی زانایانی لەسەرە لە هاوەڵانی پێغەمبەرە صلى الله عليه وسلم وە دوای ئەوانیش ; ئەگەر ئافرەتێك پاك بووەوە لە سوری مانگانە پێش ئاوابوونی خۆر نوێژی نیوەڕۆ و عەسر دەكات بەیەكەوە دەكات ،ئەگەر پێش دەركەوتنی فجر - پێش نوێژی بەیانی - پاك بوەوە نوێژی ئێوارە و عیشا دەكات پێكەوە

وروى المصنف بسنده الى يحيى بن سعيد رحمه الله فەرموویەتی :
ئەگەر شەو ئافرەت پاك بوەوە نوێژی ئێوارە و عیشا دەكات بەمەرجێك پێش دەركەوتنی فجر - پێش نوێژی بەیانی - بێت

وروى المصنف بسنده الي عبدالرحمه بن العوف رضي الله عنه فەرموويەتی : ئەگەر ئافرەت پاك بووەوە لە سوڕی مانگانە پێش ئاوابوونی خۆر نوێژی نیوەڕۆ و عەسر دەكات ،
ئەگەر پێش دەرکەوتنی فجر - پێش نوێژی بەیانی - پاك بوەوە نوێژی ئێوارە و عیشا دەكات

[و أخرج أيضاً البيهقي (١ / ٣٨٧ ) من طريق محمد بن عثمان ، وابن أبي شيبة ( ٧٢٨٢ ) من طريق محمد لكن وقع عنده ( محمد قال ؛ حدثني جدي)]

وروى المصنف ( من طريقين ) بسنده الى ابن عباس رضي الله فەرموويەتی : ئەگەر ئافرەت پاك بووەوە لە سوڕی مانگانە پێش ئاوابوونی خۆر نوێژی نیوەڕۆ و عەسر دەكات ، ئەگەر شەویش پاك بوەوە نوێژی ئێوارە و عیشا دەكات

وروى المصنف بسنده الي ابي هريرة رضي الله عنه فەرموويەتی :
ئەگەر ئافرەت پاك بووەوە لە سوڕی مانگانە فریای دووڕكات كەوت پاشان نوێژی عەسری كرد پێش ئاوابوونی خۆر ئەو نوێژی نیوەڕۆ و عەسر دەكات ، ئەگەر پێش دەرکەوتنی فجر - پێش نوێژی بەیانی - پاك بوەوە نوێژی ئێوارە و عیشا دەكات

وروى المصنف بسنده الي ابراهيم رحمه الله فەرموويەتی :
ئەگەر ئەو ئافرەتەی توشی حیض بووە پاك بووەوە لە سوڕی مانگانە لە كاتێكی عەسردا ئەوا نوێژی نیوەڕۆ و عەسر دەكات ، وە هەروەها گەر یەك تۆز خۆریش مابوو نوێژی نیوەڕۆ و عەسر دەكات، یا یەك تۆزی شەویش مابوو پاك بوەوە نوێژی ئێوارە و عیشا دەكات

[مسائل حرب بن إسماعيل الكرماني
كتاب الحيض : صـ ٣١٩-٣٢١رقم الآثار ٦٤٧ ـ ٦٥١]

# دەروازەیی سێـــنزە

## | چۆنیەتی پاك كردنەوەی پۆشاك ئەگەر خوێنی بێ نوێژی (حیض) ی لێکەوتت |

له أسماء ـی كچی أبو بكر ـەوە ڕیوایەتکراوە، دەڵێت : ئافرەتێك هاتە خزمەتی رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ عەرزیکرد : یەکێك لە ئێمە خوێنی بێنوێژی بە پۆشاکی خۆیەوە دەبینێ چی بکات باشە؟
رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرمووی : ئەو بەشەیی پۆشاکەکە خوێنەکەی لێکەوتووە بیپروێنێت و ئەوجا بیکرێنەوە پاشان ئاوی پیدابکە و بیگوشە پاشان نوێژ بەوپۆشاکەوە بکە.*

له أسماء ـی كچی أبو بكر ـەوە ـ رضي الله عنه ـ ڕیوایەتکراوە بەلەفزێکی تر و دەڵێت : ئافرەتێك هاتە خزمەتی رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ عەرزی کرد : یەکێك لە ئێمە پۆشاکەکەیی خوێنی بێنوێژی بەردەکەوێت، چۆن پاکی بکاتەوە؟
رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرموویی : بیپروێنەو پاشان تەڕی بکەو بیکرێنە ئەوجا بەئاو بیشۆ، پاشان نوێژی پێوە بکە، ئەگەر دوای ئەم پرواندنە و کڕاندن و لەئاو هەڵکێشانە تارمایی و ئەثەرو شوێنەوارێکی پێوەما قەیناکا.*

له أبي هريرة ـوە ـ رضي الله عنه ـ ڕیوایەت کراوە دەڵێت : خەولە ـی کچی یەسار عەرزی رسول الله ـی ـ صلى الله عليه وسلم ـ کرد ووتی : من تەنها یەك کراسم هەیە، بەو کراسەوە دەکەومە بێنوێژییەوە، هەڵبەتە هەندێ لە کراسەکەمم خوێناوی دەبێ، چبکەم باشە؟
رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرمووی : ئەگەر لە بێ نوێژی پاکبوویتەوە، ئەو شوێنەی لە پۆشاکەکە خوێنی بێ نوێژییەکەی بەرکەوتووە بیپرووێنە و بیشۆرە، پاشان دەتوانی نوێژ لەو پۆشاکەدا بکەی.

خەوله ووتی : ئەی رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ ئەگەر بەو شێوە پاككردنەوە ئەثەرو شوێنەواری خوێنەكە لانەچوو؟
رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرمووی : ئەو شێوە پاك كردنەوە و شتنە ئەنجامبدە و لەئاوی هەڵكێشە، مانەوەی شووێنەوارەكەی زيانت پێ ناگەیەنێ*.

[ متفق عليه(م/١/٢٤٠/٢٩١ واللفظ له. خ/١/٤١٠/٣٠٧]
[صحيح (ص، جه (٢٩٠٧)، (ت ٣/١٣٥/١٧٨٢/)، (حم ١/٢٣٠/٤٩)]
[ص. (د ٣٥١)و (٢/٢٦/٣٦١)]

٢٦٩ ـ لە دايكە عئشة ـوە ـ رضي الله عنها ـ هاتووە، كە ووتويەتی : من و رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ لە پۆشاكێكدا پێكەوە خەوتين لەكاتێكدا كە من بێ نوێژبووم، ئەگەر خوێنی بێ نوێژيەكەمم بەری پۆشاكەكەی بكەوتايە تەنها شوێنەكەی دەشت، پاشان نوێژی پێوەدەكرد.

[سنن أبو داود السجستاني]

# دەروازەیی چـــواردە

## | باسی ئایا ئافرەتی المستحاضة(واتە ئەو ئافرەتانەی کەوا بەردەوام خوێنیان هەیە)هاوسەرەکانیان جیماعیان لەگەل دەکەن(واتە سەرجێیان بۆ درووستە)؟ |

٨٤٥ ـ لە ابن عباس ـوە ـ رضي الله عنهما ـ گێردراوەتەوە دەربارەیی ئافرەتی موستەحازە کە پێی وانەبووە هیچی تیابێت کە هاوسەرەکەی بچێتەلای بۆ سەرجێیی کردن.

٨٤٦ ـ لە سالم الأفطس گێردراوەتەوە، ووتویەتی : سعید بن جبیر پرسیاری لێکرا کە ئایا سەرجێیی لەگەڵ ئافرەتی موستەحازەدا دەکرێت(ئایا دروستە)؟
ووتی : نوێژ لە سەرجێیی و جیماع گەورەترە(واتە مادەم نوێژ بکات و لێی حەرام نەبێت، ئەوە جیماع ـیشی بۆ دروستە و لێی حەڕام نیە).

٨٤٧ ـ لە سعید بن المسیب گێردراوەتەوە، ووتویەتی : ئافرەتی موستەحازە هاوسەرەکەی دەچێتەلای و درووستە.

٨٤٧ ـ لە حسن گێردراوەتەوە، دەربارەی ئافرەتی موستەحازە ووتویەتی : هاوسەری لەتەکی تێکەڵ دەبێت (واتە جیماعیان بۆ درووستە).

٨٥١ ـ لە حسن گێردراوەتەوە، ووتویەتی : ئافرەتی موستەحازە هاوسەرەکەی دەچێتەلای.

٨٥٣ ـ لە ئیمامی علي ـ رضي الله عنە ـ گێردراوەتەوە، ووتویەتی : ئافرەتی موستەحازە هاوسەرەکەی لەتەکی جووت دەبێت(جیماعیان بۆ دروستە).

٨٥٤ ـ لە سعيد بن المسيب و الحسن و عطاء گێڕدراوەتەوە، دەربارەی ئافرەتی موستەحازە ووتویانە : خۆی دەشۆرێت و نوێژ دەکات و ڕەمەزان بە ڕۆژوو دەبێت و هاوسەری دەچێتەلای.

[سنن الدارمي / إسناده صحيح].

الكوسج دەڵێت : ووتم ئافرەتی مستحاضة تەواف دەکات و پیاو دەچێتە لای؟

ئیمام أحمد ووتی : تەواف دەکات و پیاوەکەشی ناچێتە لای، ئیللا ئەوە نەبێت کە زۆری بۆ دێنێت (واتا پیاوەکە)

اسحاق گووتی : پیاوەکەی دەچێتە لای، نوێژ گەورەترە، وە ئەوە گەر استحاضەکە بۆی رون بوو.

[مسائل الكوسج (٧٢٣)].

ابو داود دەڵێت : پرسیارم کرد لە امام أحمد بن حنبل ـ رحمه الله ـ ئایە ئافرەتی مستحاضة، پیاوەکەی دەچێتە لای؟
ئیمام أحمد فەرمووی : لا يعجبني (ئەم وەڵامە لای ئیمام احمد واتا کەراهەتی هەیە )

[مسائل ابو داود (١٧٥)].

المرداوي دەڵێت : جائیز نییە ئیللا لەکاتی زەرورەت نەبێت یان ترسی هەبێت لە زینا .

[الروايتين (١/١٠٣)].

ئیمامی حرب ـ رحمه الله ـ ریواتێکمان بۆ نقل دەکات لە ئیمام احمد ـەوە ـ رحمه الله ـ کە دەڵێت : ئافرەتی مستحاضة پیاوەکەی ناچێتە لای، ئیلا گەر صبری نەبێت (واتا نەتوانێت زاڵ ببێت بەسەر خۆیدا)

وە لەمەدا هەریەکە لە (المروذي و صالح و الكوسج و علي بن سعيد) موافەقەیان کردووە .
وە ئەمە مەزهەبە وە ئەصحابی حنابلە لەسەرین وە الخرقی ئەمەی هەڵبژاردووە .

وە لە الفروع ووتی : وە حەرامە چونەلای گەر ترسی زینای نەبوو (واتا حەرامە بچێتە لای گەر خۆی پێ رابگیرێت و صبری لەسەر بگرێت )

[١- الروايتين (١/١٠)
٢- فتح الباري لابن رجب ( ٢/١٨٢)
٣- الاقناع (١/٧١)
٤- الانصاف ( ٢/٤٦٩)
٥- شرح الكبير ( ٢\٤٦٩) ]

## وە بەڵگە لە قورئان

{وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ ۖ قُلْ هُوَ أَذًى فَاعْتَزِلُوا النِّسَاءَ فِي الْمَحِيضِ ۖ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ ۖ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللَّهُ ۚ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ} [البقرة(٢٢٢)]

## وە بەڵگە لە سوننەت

هەروەك لە دایکمان عائیشە ـ رضي الله عنها ـ ریواتکراوە، ئافرەتی موستحاضە پیاوەکەی ناچێتە لای .

[ السنن الكبرى للبيهقي].

تێبینی / هەرچەندە قسەی لەسەرە کەوا ئەم ریواتە هی دایکمان عائیشە نەبێت و هی ئیمام الشعبة بێت بەڵام ئێمە مەبەستمان لە حوکمەکەیە.

# دەروازەیی پـــانزە

## | باسی دەربارەیی خۆشۆردنی ئافرەتی حائیض و مستحاض ـە |

٨٠١ ـ لە دایکە عائشة ـوە ـ رضي الله عنها ـ، گێردراوەتەوە، ووتویەتی:
ئافرەتێکی ئەنصاری پرسیاری لە رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ کرد دەربارەیی خۆشۆردن لە سوڕی مانگانە، رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرمووی : ئاو و سیدر بێنە (لە جێگایی شامپۆ و صابوونی ئێستا بەکارهێنراوە)، دواتر خۆت بشۆرە و خۆت پاك بکەرەوە و ئاو بەسەر سەرت دابکە تا (ئاوەکە بە جوانی) دەگاتە بنچینەو ناوەوەی پێست و مووەکانی سەرت و(خۆت جوان بشۆرە)، دواتر پارچە پەمۆییێك پارچە لۆکەیەك یان پارچە سوفێکی بە میسك (گوڵاو) بێنە و بەکاری بهێنە، ئافرەتەکە ووتی : چی لە پارچە پەمۆکە بکەم(چۆن بەکاری بهێنم)؟
رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ لەبەر شەرم کردن بێ دەنگ بوو (هیچی نەفەرموو)،
ئافرەتەکە (دووبارە) ووتی : چی لێ بکەم (چۆن بەکاری بهێنم) ئەی رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ ؟
رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ بێ دەنگ بوو هیچی نەفەرموو،
دایکە عائشة ـ رضي الله عنها ـ ووتی : پارچە پەمۆییێکی بە میسك بێنە و لە شوێنی خوێنەکە داینێ و (بە شتێك ببیەستە، تا بۆنی ناخۆشی نەمێنێ)، رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ گوێی لێ بوو و ئینکاری نەکرد و قسەی نەکرد (واتە شێوازەکەی عائشة ـ رضي الله عنها ـ )، ڕاست و ڕێك بوو و ئەوەش مەبەستی رسول الله بوو ـ صلى الله عليه وسلم ـ.

٨٠٢ ـ لە دایکە عائشة ـوە ـ رضي الله عنها ـ گێردراوەتەوە، ووتویەتی :
فاطمة بنت أبي حبيش هات بۆ خزمەتی رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ ووتی : ئەی رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ من ئافرەتێکم تووشی خوێنی سوڕی مانگانە دەبم و پاك نابمەوە (جا نازانم ئەو هەموو خوێنە هی حیضە یان نا) جا ئایا واز لە نوێژ بێنم (لەو هەموو ماوەیە)؟

رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرمووی : نەخێر، ئەوە تەنها دەمارێکە (خوێنی لێوەدێ و هەمووی خوێنی حیض نییە، چونکە خوێنی حیض لە قوڵایی ڕەحم دەردەچێت)، بۆیە ئەگەر سوڕی مانگانەت هات و (لەو کات و ماوەیەی عادەتی خۆتە) ئەوە واز لە نوێژ بهێنە، وە ئەگەریش حیض ـەکەت ڕۆشت و نەما ئەوە خوێن لە خۆت بشۆرە و نوێژبکە (هەر چەندە خوێنت هەر بەردەوام بێت، ئەوە حیض نییەو نابێ واز لە نوێژ کردن بهێنی).

٨٠٥ ـ لە شوعبـەوە ووتویەتی : پرسیارم لە عبدالرحمان بن القاسم کرد دەربارەیی ئافرەتی موستەحازە (کە خوێنی بەردەوامی نەخۆشی هەیە)ئەویش بۆی گێڕامەوە لە باوکیەوە، ئەویش لە دایکە عائشة ـوە ـ رضي الله عنها ـ، گێڕاوەتەوە کە ئافرەتێك تووشی خوێن چرکەی نەخۆشی بوو لەسەردەمی رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ و فەرمانی پێ کرا، شوعبە دەڵێت : بە عبدالرحمان م ووت : رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرمانی پێ کرد؟
ووتی : من هیچ شتێکت بۆ ناگێڕمەوە لە رسول الله ـوە ـ صلى الله عليه وسلم ـ ، (چونکە بە ڕاشکاوی پێم نەگەیشتووە فەرمانی لەلایەن کێوە پێ کراوە تاوەکو بڵێم رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ بووە فەرمانی پێ کردووە)،
ووتی : تەنها ئەوەندە دەزانم ئافرەتەکە فەرمانی پێ کراوە کە نوێژی نێوەڕۆ تاخیربکات (تانزیکی عەسر) و نوێژی عەسریش زوو بکات و بۆ هەردووکیان یەك غوسڵ بکات، هەروەها نوێژی مەغریب تاخیربکات تا نزیك عیشا و نوێژی عیشا زووبکات و بۆ هەردووکیان یەك غوسڵ بکات، وە غوسڵێك ێش بۆ نوێژیی بەیانی بکات (بەڵام دەبێتت غوسڵەکە بەر لە ئەنجامدانی نوێژەکان بکات، وە ئەم جۆری غوسڵ دەرکردنە مەشەقەت و هیلاکی تێدایە بۆیە ڕایی ڕاجح ئەوەیە کە بۆ هەموو نوێژێك دەست نوێژی تازە بگرێتەوە

بە مەرجێ کاتیی نوێژەکە هاتبێت و ڕاستەوخۆ نوێژەکەیی بکات و هیچ فاصیلەیەك لە نێوان دەست نوێژ گرتنەکەی و نوێژەکەیی نەبێتت واللە اعلم و بصواب).

تێبینی / بۆ زانینی بەڵگەیی زیاترر دەتوانن سەیری سنن ـی ألدارمی بکەن لە لاپەڕە(٢٩٢).

[إسناده صحيح، سنن الدارمي ]

٨٢٠ ـ لە دایکە عائشة ـوە ـ رضي الله عنها ـ گێردراوەتەوە دەربارەی ئافرەتی موستەحازە ووتویەتی : چاوەڕێی ئەو ڕۆژانەی دەکات کە تیایدا وازی لە نوێژ دەهێنا (لەو ماوەیە نوێژەکانی ئەنجام نادات، چونکە کاتی سوڕیی مانگانەیە)، جا ئەگەر ڕۆژی پاکیەتیەکەی هات کە تیایدا لە خوێنی حیض پاك دەبێتەوە خۆی دەشۆرێت، دواتر بۆ هەموو نوێژێك دەستنوێژ دەشۆرێت و نوێژ دەکات.

٨٢٣ ـ لە معتمر لە باوکیەوە گێراویەتیەوە ووتویەتی : بە قتادة ـم ووت : ئافرەتێك کە (ڕۆژانی) حیض ـی دیار و ئاشکرایە و دەزانێ، (بەڵام خوێن بینینەکەی) پێنج ڕۆژ یان چوار ڕۆژ یان سێ ڕۆژ زیاد دەبێت (چی دەکات لەو حاڵەتە ئایا نوێژ دەکات)؟

قتادة ووتی : نوێژ دەکات،

ووتم : ئەی دوو ڕۆژ؟

قتادة ووتی : ئەوە لەگەڵ حیض ـەکەی حیسابە (واتە دوو ڕۆژ ئەگەر لە حیض ـەکەشی زیاتر بوو هەر نوێژ ناکات و بە سوڕی مانگانە حیسابە، بەڵام ئەگەر ماوەکە لەوە زیاتر درێژ بوویەوە و گەیشتە سێ ڕۆژ و زیاتر ئەوە سوڕی مانگانە نییە و دەبێ نوێژبکات).

وە باوکی معتمر دەڵێت : پرسیارم لە ابن سيرين کرد،

ووتی : ئافرەتان زاناترن بەو کارە (واتە ئەوان دەزانن هەر خوێنی حیض ـە یان نا).

٨٢٤ ـ لە حسن بصري ـەوە گێردراوەتەوە دەربارەی ئەو ئافرەتەی خوێن دەبینێ لە ڕۆژانی پاکیەتی (کە ڕۆژانی حیض ـی تێپەڕاندووە)؟
ووتویەتی : پێم وایە دەبێ خۆی بشۆرێ و نوێژبکات.

٨٢٧ ـ لە دایکە عائشة ـوە ـ رضي الله عنها ـ گێردراوەتەوە، ووتویەتی : ئافرەتی موستەحازە کە خوێن چڕکەی هەیە، ڕۆژانی حیض ـەکەی دادەنیشێت(نوێژناکات)، دواتر (کە پاك بوویەوە) یەك غوسڵ دەکات و دەستنوێژ دەشۆرێت بۆ هەموو نوێژێك.

تێبینی / بۆ زانینی بەڵگەی زیاتر تەماشایی کتابی سنن الدارمي بکەن لاپەڕە (٢٩٤ ..)

# دەروازەیی شـــــانزە

## | باسی ئەوانەیی ووتویانە هاوسەری ئافرەتی مستحاض ـە نابێ سەرجێیی لەگەڵ بکات |

٨٥٥ - لە حسن بصری ـەوە گێردراوەتەوە، ووتویەتی : ئافرەتی مستحاض ـە هاوسەرەکەی جیماعی لەگەڵ ناکات،
ابو نعمان ووتویەتی : یحیی بن سعید قطان پێی ووتوم : نەمزانیوە کەس ئەو قسەیە لە حسن ـەوە بگێڕێتەوە، (لەبەر ئەوەی لە ڕوایەتەکانی دیکەی حسن ڕەئی جیاوازە و پێی وایە دروستە سەرجێی کردن).

٨٥٦ - لە خالد ـەوە گێردراوەتەوە، ووتویەتی : محمد پێی باش نەبووە (بەکارێکی خراپی دەزانی) پیاو جیماع لەگەڵ خێزانەکەیی لەکاتێکدا کە مستحاض ـەیە(خوێن چڕکەی هەیە).

٨٥٧ - لە إبراهیم ـەوە گێردراوەتەوە، ووتویەتی : ئافرەتی مستحاض ـە هاوسەرەکەیی ناچێتە لای (لەگەڵی جیماع ناکات) و بە ڕۆژوو نابێت و دەست لە قورئان ـیش نادات، تەنها لە نوێژدا ڕێگای پێ دراوە (تەنها نوێژ دەکات)،
بەڵام یزید ووتویەتی : هاوسەرەکەی لەگەڵی جیماع دەکات و بۆی حەڵاڵە هەموو ئەو شتانەی کە بۆ کەسێکی پاك حەڵاڵە، (ئەم دوو زانا بەڕێزە ڕای جیاوازن لەم بارەوە).

## | باسی دەربارەیی کچ (کە تازە تووشی سوڕی مانگانە دەبێت و خوێنی بەردەوام دەبێت |

٨٧٦ - لە قیس بن سعید و عطاء ـوە گێردراوەتەوە، هەر دووکیان دەربارەی کچ کاتێ تووشی سوڕی مانگانە دەبێت و خوێنەکەی بەردەوام دەبێت، ووتویانە : واز لە نوێژ دەهێنێ وەك ئەو ماوەیەیی ئافرەتێك لە ئافرەتانی هاو تەمەنی خۆی وازی لێ دەهێنن (واتە ئەو کچەی کە یەکەم

جار دەکەوێتە سوڕی مانگانە نازانێت ماوەکەی چەندە، بۆیە با خۆی تەقلیدی ئافرەتێکی هاوشێوەی خۆی بکات لە تەمەندا و بە ئەندازەی ماوەکەی ئەو واز لە نوێژ بهێنێت، خوێنەکەی دوای ئەو ماوەیەش بە مستحاض ـە ئەژمار دەکرێت.

٨٧٧ - لە سفیان ووتویەتی : ئەگەر ئافرەت یەکەم جاری بوو سوڕی مانگانەی دەبینی لە سوڕی مانگانە دادەنیشێت هاوشێوەی ئافرەتانی وەك خۆی، پرسیار لە عبدالله کرا دەربارەی ئەوە؟
ووتی : ئەوە نزیکترین شتە (واتە تەواوە با خۆی تەقلیدی ئافرەتانی هاو تەمەنی خۆی بکات).

## | باسی دەربارەی ئافرەتی بە تەمەن کە خوێن ببینێ |

٨٧٨ - لە عطاء ـەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی ئافرەتی بە تەمەن کە خوێن ببینێ؟
ووتویەتی : بە حیض ـی دانانێت.

[إسناده صحيح، سنن الدارمي (لا : ٣٠٤، ٣٠٢)

# دەروازەیی حـــــەڤــدە

## | باسی دەربارەیی پاکیەتی چۆنە (چۆن دەناسرێتەوە) |

٨٨٦ ـ لە عمرة گێردراوەتەوە، ووتویەتی : دایکە عائشة ـ رضي الله عنها ـ نەهی لە ئافرەتان دەکرد کە بە شەو سەیری شوێنی حیض بکەن (والله اعلم چونکە ئەوکاتت دوونیا تاریك بووە و وەك ئێستاا کارەباو ڕووناکی نەبووە، بەدەرنەکەوتوە)
و دەی ووت : جاری وا هەیە زەردایەتی و لێڵایەتیە (واتە ڕەنگە ئەگەر بەشەو سەیری بکەن وابزانن پاك بوونەتەوە و دەستت بە نوێژ کردن بکەن، لە کاتێکدا ڕەنگە پاك نە بووبنەوە بە تەواوی، بەڵکو زەردایەتی و لێڵایەتی هەر مابێ، بەڵام چونکە بە شەو سەیریان کردووە بۆیە نەیانبینیوە).

٨٨٨ ـ ئیمام سفیان ووتویەتی : لێڵی و زەردی لە ڕۆژانی سوڕی مانگانەدا بە سوڕی مانگانە ئەژمار دەکرێت، وە هەموو شتێك کە بینیویەتی پاش ڕۆژانی سوڕی مانگانە لە خوێن، یان لێڵی یان زەردی ئەوە مستحاض ـەیە (خوێنە چڕکە) یە،
پرسیار لە عبدالله کرا ووترا قسەیی سفیان وەردەگیرێت؟
ووتی : بەڵێ.

٨٩٠ ـ لە أسماء ـ رضي الله عنها ـ گێردراوەتەوە، ووتویەتی : ئێمە لە ماڵی عەمرە ـت بووین جا یەکێك لە ئێمە تووشی حیض دەبوو دواتر پاك دەبوویەوە و خۆی دەشۆرد و نوێژی دەکرد، دواتر زەردایەتیەکی کەم دەگەڕایەوە، عەمرەتیش فەرمانی پێ دەکردین کە لە نوێژ دوور بکەوینەوە تاوەکو هیچ شتێك نەبینین جگە لە سپیایی تەواو.

٨٩١ ـ لە عطاء ـوە گێردراوەتەوە، ووتویەتی : لێڵی و زەردی لە ڕۆژانی سوڕی مانگانەدا بە سوڕی مانگانە حیسابە.

٨٩٣ - ئیمام الحسن زەردایەتی و لێلایەتی و ئەوەی وەك شۆراوەی گۆشتە بە هیچی ئەژمار نەدەکرد (واتە لەلای ئەو ئەو شتانە بە خوێنی حیض حیساب نەبوون).

٨٩٤ - لە أم عطیة گێردراوەتەوە، ووتویەتی : ئێمە زەردایەتی و لێلایەتیمان بە هیچ ئەژمار نەدەکرد.

## | باسی حوکمی لێلایەتی ئەگەر لەدوای سوڕی مانگانە دەرکەوت |

٨٩٥ - لە الحسن گێردراوەتەوە، دەربارەیی ئافرەت کە خوێن ببینێت لە ڕۆژانی پاکیەتیدا؟
ووتویەتی : من پێم وایە کە خۆی دەشۆرێت و نوێژ دەکات.

٨٩٦ - ابن سیرین ووتویەتی : ئەوان پێیان وانەبووە لێلایەتی و زەردایەتی هیچی تیابێت.

٨٩٨ - لە الحسن گێردراوەتەوە، ووتویەتی : تەرییە (کە ڕەنگێکی زۆر ئاجوغی نێوان زەردایەتی و لێلایەتیە) هیچ شتێك نییە لە دوای خۆشۆردن تەنها پاکیەتی نەبێت (واتە بە پاکیەتی حیسابە)، عبدالله ووتویەتی : (تەرییە) زەردایەتی و لێلایەتیە.

٩٠٠ - لە عطاء ـوە گێردراوەتەوە، ووتویەتی : تەرییە (زەردایەتی و لێلایەتی) پاشی خۆشۆردن هیچ نییە، جگە لە پاکیەتی.

٩٠١ - أم عطیة ـ رضي الله عنها ـ کە یەکێك لەو کەسانە بووە بەیعەتی بە رسول الله ـ صلى الله علیه وسلم ـ داوە گێردراوەتەوە، ووتویەتی : ئێمە لێلایەتی و زەردایەتیمان لە پاشی خۆشۆردن بە هیچ ئەژمار نەدەکرد.

٩٠٢ ـ له الحسن ـ رضي الله عنه ـ گێردراوەتەوە، ووتویەتی : ئەگەر هەر کات ئافرەتی حیض ـدار خوێنی سوری گەش و زۆری بینی پاشی خۆشۆردن (له خوێنی حیض) به ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ ئەوە یەك ڕۆژ واز له نوێژ دەهێنێ، دواتر خوێنەکه پاش ئەو ماوەیه (پاش ئەو ڕۆژە) به مستحاض ـه حیسابه (واته دەبێ خۆی بۆ بشۆرێ و دەستنوێژ بۆ هەموو نوێژێك بشۆرێ و نوێژەکەی بکات).

٩٠٩ ـ أبو محمد ووتویەتی : لەلای زید بن یحیی خوێندومه له مالیك ـەوە گێردراوەتەوە، ووتی : پرسیارم لێ کرد دەربارەی ئەو ئافرەتەی سوڕی مانگانەکەی (به عادەتی خۆی) حەوت ڕۆژە و حیض ـەکەیی زیاد دەبێت (حوکمی ئەو ڕۆژە زیادانه چییه)؟
ووتی : پاك دەبێتەوە به سێ ڕۆژان (واته سێ ڕۆژیتریشی بۆ به حیض ئەژمار دەکرێت و له پاشان ئەگەر خوێن هات به حیض حیسابه نیەو دەبێ نوێژەکانی بکات، بەڵکو به مستحاض ـه حیسابه).

[سنن الدارمي اسناده صحيح (لا : ٣١٣)]

# دەروازەیی هـــەژدە

## | باسی حوکمی ئەو ئافرەتەیی کە پاك دەبێتەوە، یان تووشی سوڕی مانگانە دەبێت لە کاتی نوێژدا |

٩١٠ ـ لە الحسن ـ رضي الله عنه ـ گێردراوەتەوە، ووتویەتی : ئەگەر ئافرەت پاك بوویەوە لە کاتی نوێژێکدا و خوی نەشۆرد لە کاتێکدا دەیتوانی خۆی بشۆرێت، ئەوە ئەو نوێژە قەزا دەکاتەوە و دەیگێڕێتەوە (چونکە کەوتوەتە سەر شانی، تاوانباریش دەبێ).

٩١١ ـ لە الحسن ـ رضي الله عنه ـ گێردراوەتەوە، ووتویەتی : ئەگەر ئافرەت دوو ڕەکعەت نوێژی کردو تووشی سوڕی مانگانە بوو ئەوە ئەو نوێژە قەزا ناکاتەوە و نایگێڕێتەوە کاتێ پاك بوویەوە.

٩١٢ ـ لە قتادة ـشەوە گێردراوەتەوە بە هەمان شێوەز.

٩١٦ ـ لە إبراهیم ـەوە گێردراوەتەوە، دەربارەی ئەو ئافرەتەی کەمتەرخەمی دەکات (لە کردنی نوێژەکەیدا) تاوەکو سوڕی مانگانەی پێ دەگات و (ئەو کات ناتوانێت نوێژەکەی بکات)، ووتویانە : ئەو نوێژە قەزا دەکاتەوە و دەیگێڕێتەوە.

٩١٧ ـ لە حماد بن أبي سلیمان و الحسن گێردراوەتەوە، دەربارەی ئافرەتێك کە کاتی نوێژ بێت و کەمتەرخەمی بکات، تا توشی سوڕی مانگانە دەبێت، ووتویانە : کاتێك خۆی شۆرد ئەو نوێژە قەزا دەکاتەوە.

٩١٨ ـ لە الحسن و قتادة ـوە گێردراوەتەوە، ووتویانە : ئەگەر ئافرەت نوێژی فەوتاند و (ئەنجامی نەدا) تا تووشی سوڕی مانگانە بوو، ئەوە قەزا کردنەوەی لەسەرە کاتێ پاك دەبێتەوە.

٩١٩ ـ <u>له الشعبي گێڕدراوەتەوە، ووتویەتی :</u> ئەگەر ئافرەت کەمتەرخەمی کرد (لەکردنی نوێژدا و زوو ئەنجامی نەدا) دواتر تووشی سوڕی مانگانە بوو ئەوە قەزای دەکاتەوە.

٩٢٠ ـ <u>له سعيد بن جبير ـەوە گێڕدراوەتەوە، ووتویەتی :</u> گەر ئافرەت لە کاتی نوێژێکدا تووشی سوڕی مانگانەبوو (والله اعلم واتە لەناو نوێژەکە توشی سوڕی مانگانەبوو)ئەوە قەزاکردنەوەی نوێژەکەی لەسەر نییە.

تێبینی / کەواتە ئافرەت دەبێت ئەو ڕۆژەی کە دەزانێتت تووشی سوڕیی مانگانە دەبێت، زوو نوێژەکانی لە کاتی خۆیدا ئەنجام بدات، تاوەکو تووشی تاوانباری کەمتەرخەمی و دووبارەکردنەوە نەبێت، والله اعلم.

[سنن الدارمي مجلد (١): لا(٣١٧) إسناده صحيح]

# دەروازەیی نـــــــوزدە

## | باسی ئەو ئافرەتەیی تەڵاقدەدرێت چەندێك دانیشێت لەكاتێك سوڕی مانگانەی نەماوە گەنج یشە؟|

٩٤٤ ـ لە عبدالله بن مسلمة ـوە گێردراوەتەوە، ووتویەتی : پرسیار لە ئیمامی مالك كرا دەربارەیی عیددەی ئافرەتی مستحاض ـە ئەگەر تەڵاق درابێت؟
ئیمام مالك بۆی گێراینەوە لە ابن شهاب، ئەویش لە سعید بن المسیب گێڕاویەتیەوە كە ووتویەتی : عیددەكەی ساڵێك،
ابو محمد ووتی : ئەوە بۆچوونی ئیمام مالك ـیكە.

٩٤٥ ـ لە عمرو بن دینار گێردراوەتەوە، ووتویەتی : پرسیار لە جابر بن زید كرا دەربارەیی ئەو ئافرەتەیی كە تەڵاق دەدرێت لەكاتێكدا گەنجەو سوڕی مانگانەكەیی نامێنێت (لەدەستی دەدات) بێ ئەوەی تەمەنی گەورە بێت؟
ووتی : بەبێ سۆڕی مانگانە حوكمی حیض ـی بۆ دەدرێت،
ئیمام طاوس ـیش ووتویەتی : عیددەكەی سێ مانگە.

٩٤٦ ـ لە زهري گێردراوەتەوە، ووتویەتی : ئەگەر پیاو ئافرەتەكەی تەڵاقداو حیض ـێك یان دوو حیض ـی بینی، دواتر حیض ـەكەی نەما (لەدەستیدا) ئەگەر لەبەر بەتەمەنی بوو ئەوە سێ مانگ عیددە دەبینێ، ئەگەر گەنجیش بوو عادەتی (سوڕی مانگانەی) تێكچوو ئەوە ساڵێك عیددە دەبینێ پاش تێكەڵی و گومان پەیدابوونەكە.

٩٤٧ ـ لە عكرمة گێردراوەتەوە، ووتویەتی : ئافرەتی مستحاض ـە و ئەو ئافرەتەیی كە سوڕیی مانگانەی جێگیر نابێت و مانگ هەیە جارێك سوڕی مانگانە دەبینێت، مانگ ـیش هەیە دوو جار دەیبینێ، ئەوە عیددەكەی سێ مانگە.

٩٤٨ ـ له حماد گێردراوەتەوە، ووتویەتی : عیددە دەبینێ بە سێ پاك بوونەوە.

٩٥٧ ـ له الأوزاعي گێردراوەتەوە، ووتویەتی : پرسیارم له زهري كرد دەربارەیی ئەو پیاوەی جارییەك دەكڕێت كە تەمەنی نەگەیشتۆتە ئەوەی سوڕی مانگانە ببینێ و هاوچەشنی ئەو جارییەش دووگیان نابن(چونكە تەمەنی بچوكە) جا ماوەی چەند چاوەڕێ دەكات (بۆ ئیستبڕائی ڕەحم، تاوەكو ڕوون ببێتەوە ڕەحمی هیچی تیانیە)؟
ووتی : بە سێ مانگ.

٩٥٨ ـ له يحيى بن أبي كثير ووتویەتی : بە چل و پێنج ڕۆژ دەردەكەوێ.

٩٥٩ ـ له ابن عباس ـ رضي الله عنه ـ گێردراوەتەوە، كە هەموو جار دەربارەی ئافرەتی مستحاضـ ـە دەی ووت : خۆیی دەشۆرێ لە كاتی هەموو نوێژێكدا و نوێژدەكات.

٩٦١ ـ حماد ووتویەتی : ئەگەر ئافرەتێكی مستحاضـ ـە نەیزانی (خوێنەكەی ئیستحاضـ ـەیە وایزانی خوێنی حیضـ ـە) و یەك مانگ وازی لە نوێژ هێنا، ئەوە ئەو نوێژانە قەزا دەكاتەوە (دەیگێڕێتەوە)،
پێی ووترا : چۆن قەزایان دەكاتەوە؟
ووتی : لە یەك ڕۆژدا قەزایان دەكاتەوە ئەگەر توانی،
بە عبدالله ووترا : تۆش ئاوا دەڵێی؟
ووتی : ئەرێ والله.

## | باسی دەربارەیی حوكمی ئافرەتی دووگیان ئەگەر خوێنی بینی |

٩٦٢ - لە مالك بن أنس گێردراوەتەوە، ووتویەتی : پرسیارم لە زهری كرد دەربارەیی ئافرەتی حامیلە كە خوێن ببینێ؟
ووتی : واز لە نوێژ دەهێنێ (مادەم خوێنەكە هی حیض ـە).

٩٦٣ ـ لە عثمان بن الأسود گێردراوەتەوە، ووتویەتی : پرسیارم لە مجاهد كرد دەربارەیی ئافرەتەكەمم كە خوێن دەبینێ لەكاتێكدا من دەیبینم دووگیانە،
ووتی : ئەوە كەم بوونەوەی ڕەحمە (ناو ڕەحمی ئافرەتەكە)، وەك الله تعالی دەفەرموویت : { ٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تَحۡمِلُ كُلُّ أُنثَىٰ وَمَا تَغِيضُ ٱلۡأَرۡحَامُ وَمَا تَزۡدَادُۖ} [سُورَةُ الرَّعۡدِ: ٨]
واتە : {الله تعالى چاك دەزانێت بەوەی هەموو مێیینەیەك چی لە سكیدا هەڵگرتووە، هەروەها دەزانێت بەوەش كە دەیبوكێتەوە و كەم دەكات و لەبار دەچێت و بەوەش كە زیاد دەكات و گەورە دەبێت}،
جا هەر شتێك كەم بكات هاو وێنەكەی لە ڕەحم زیاد دەكات (واتە ئەو خوێنەی ئافرەتی دووگیان حامیلە دەیبینێ ئەوە خوێنی ڕەحمە لە بەشی منداڵەكەیە دێتە دەرەوە، لە خوێنەكە كەم دەكات و دواتر ئەو ئەندازەیە درووست دەبێتەوە لە ڕەحمدا).

٩٦٤ - لە عكرمة ـوە گێردراوەتەوە، دەربارەیی ئەو ئایەتەی الله تعالى دەفەرموویت :{ ٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تَحۡمِلُ كُلُّ أُنثَىٰ وَمَا تَغِيضُ ٱلۡأَرۡحَامُ وَمَا تَزۡدَادُۖ وَكُلُّ شَيۡءٍ عِندَهُۥ بِمِقۡدَارٍ } [سُورَةُ الرَّعۡدِ: ٨]
واتە : {الله تعالى چاك دەزانێت بەوەی هەموو مێیینەیەك چی لە سكیدا هەڵگرتووە، هەروەها دەزانێت بەوەش كە دەیبوكێتەوە و كەم دەكات و لەبار دەچێت و بەوەش كە زیاد دەكات و گەورە دەبێت، هەموو شتێك لای ئەو زاتە بە ئەندازە و پێوانەیە}،

ووتی : ئەوە سوڕی مانگانەیە لەسەر دووگیانی (لە حاڵەتی دووگیانیدا) ئافرەت هیچ ڕۆژێك نییە تووشی حیض ببێت لە حاڵەتی دووگیانیدا حەتمەن پاکیەتی زیاد دەکات لە حەملەکەیدا.

٩٦٦ ـ لە عکرمة ـوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەیی ئەو ئایەتە {وَمَا تَغِيضُ ٱلأَرحَامُ (٨)}

واتە : { هەروەها دەزانێت بەوەش کە دەپوکێتەوە و کەم دەکات}،

ووتویەتی : ئەوە حیض ـە لەسەر دووگیانی، وە کە دەفەرژوویت {وَمَا تَزدَادُ} : واتە : {هەروەها زانایە بەوەش کە زیاد دەکات}

ووتویەتی : بەگشت ڕۆژێك کە تووشی حیض دەبێت لە حاڵەتی دوو گیانیەکەی ڕۆژێکی بۆ هەیە کە پاکیەکەیی تیادا زیاد دەکات، تاوەکو نۆ مانگی پاکیەتی تەواو دەکات.

٩٦٧ ـ لە مجاهد گێڕدراوەتەوە، دەربارەیی {وَمَا تَغِيضُ ٱلۡأَرۡحَامُ (٨)}

واتە {هەروەها دەزانێت بەوەش کە دەپوکێتەوە و کەم دەکات}.

ووتویەتی : ئەوە لەو کاتەیە کە ئافرەت تووشی حیض دەبێت لە کاتێکدا کە دووگیانە،

هەروەها ووتویەتی : ئەوە دەبێتە کەم بوونەوە لە منداڵەکە، جا ئەگەر حەملەکە زیاتری خایاند لە نۆ مانگ ئەوە تەواو کردن و پڕ کردنەوەی ئەو نەقسەیە کە لە منداڵەکەی دروست بووە.

٩٦٨ ـ لە بکر بن عبدالله المزني گێڕدراوەتەوە، کە ووتویەتی : ئافرەتەکەم سوڕیی مانگانە دەبینێ لە کاتێکدا کە دووگیانە.

٩٦٩ ـ لە أبو محمد ووتویەتی : گوێم لە سليمان بن حرب بوو دەی ووت : ئافرەتەکەمم سوڕی مانگانە دەبینێ لە کاتێکدا کە دووگیانە.

٩٧٤ ـ لە الحسن گێڕدراوەتەوە، ووتویەتی : ئەگەر ئافرەتەکە خوێنی دەبینی (ماوەیەکی زۆر) وەك (ماوەی) ئەو خوێنەی پێشتر لە سوڕی

مانگانەکەیدا(دەیبینی) ئەوە واز لە نوێژ دەهێنێ، ئەگەریش خوێن بینینەکەی تەنها لە یەك دوو ڕۆژدا بوو ئەوە واز نوێژ ناهێنێت.

٩٧٧ - لە الحسن گێڕدراوەتەوە دەربارەی ئافرەتی دووگیان کە خوێن ببینێ؟
ووتویەتی : وەك ئافرەتی مستحاض ـە واتە، تەنها ئەوە نەبێت ئافرەتی مستحاض ـە واز لە نوێژ ناهێنێت.

٩٧٨ - لە إبراهیم ـەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەیی ئافرەتی دووگیان کە خوێن ببینێ ؟
ووتویەتی : خوێن لەخۆی دەشۆرێ و دەستنوێژ دەشۆرێ و نوێژدەکات.

٩٨٠ - لە عطاء گێڕدراوەتەوە دەربارەی ئافرەتی دووگیان کە خوێن ببینێ؟
ووتویەتی : دەست نوێژ دەشۆرێ و نوێژ دەکات.

٩٨٢ - لە إبراهیم ـەوە گێڕدراوەتەوە، ووتویەتی : هیچ حیض ێك بوونی نییە لەسەر ئافرەتی دووگیان (واتە بە بۆچوونی إبراهیم نابێ ئەو خوێنە حیض بێت و دەبێت ئافرەتەکە نوێژەکانی بکات).

٩٨٣ - لە الحسن گێڕدراوەتەوە دەربارەیی ئافرەتی دووگیان کە خوێن ببینێ؟
ووتویەتی : وەك ئافرەتی مستحاض ـە وایە.

٩٨٩ - لە الحسن ـوە گێڕدراوەتەوە دەربارەیی ئافرەتی دووگیان
ووتویەتی: ئەگەر ژانی منداڵ بوون گرتی و خوێنی لەسەر منداڵەکە بینی با واز لە نوێژ بهێنێ.

[سنن الدارمي، مجلد (١) (لا : ٣٢٧) إسناده صحيح]

# دەروازەیی بـیسـتەم

## |باسی حوكمی نزیك بوونەوە لە ئافرەتی حیض دار |

١٠٧٦ ـ لە إبراهیم گێڕدراوەتەوە، ووتویەتی : ئافرەتی حەیزدار پیاوەکەی دەچێتە لای لە شوێنە شەهوەت شکێنە حەڵاڵەکان و نێوان ڕانەکانی (جگە لە ئەندامی زاوزێی)، جا ئەگەر (پیاوەکە) ئاوی هات، ئافرەتەکە ئەوەی بەری کەوتووە لە ئاوی پیاوەکەی دەیشۆرێت و پیاوەکەش خۆی دەشۆرێت (غوسڵی جەنابەت دەکات)

١٠٧٧ ـ لە إبراهیم گێڕدراوەتەوە، ووتویەتی : دایکی عیمڕان (واتە خێزانم) دەزانێت کە من شەهوەتم بە ڕانەکانی دەشکێنم، واتە لە کاتێکدا کە حیض دارە.

١٠٧٩ ـ لە دایكە عائشة ـ رضي الله عنها ـ گێڕدراوەتە، ووتویەتی : من ئەو کاتەی تووشی حیض دەبووم رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرمانی پێ دەکردم کە خوارووی لاشەم داپێۆشم، رسول الله ـیش ـ صلى الله عليه وسلم ـ لێم نزیك دەبوویەوە (هەقی یەکترمان دەدا).

١٠٨٠ ـ میمون بن مهران ووتویەتی : پرسیار لە دایکە عائشة ـ رضي الله عنها ـ کرا : ووترا : چی حەڵاڵە بۆ پیاو لە ئافرەتەکەیدا (بۆ نزیك بوونەوە لێی) لە کاتێکدا کە حیض دارە؟
ووتی : سەرەوەی شەڕوڵ (لە ناوك بەسەرەوە).

١٠٨١ ـ لە مسروق گێڕدراوەتەوە، ووتویەتی : بە دایکە عائشة م ـ رضي الله عنها ـ ووت : چی حەڵاڵە بۆ پیاو لە ئافرەتەکەیدا (بۆ نزیك بوونەوە لێی) لە کاتێکدا کە حیض دارە؟
ووتی : هەموو شتێك جگە لە جیماع،

دەڵێ ووتم : ئەی چی لەسەر حەڕامە ئەگەر هەردووکیان لە ئیحڕامدا بوون؟
ووتی : هەموو شتێك جگە لە قسەی ئافرەتەکە.

١٠٨٣ ـ لە الشعبي گێردراوەتەوە، ووتویەتی : (نزیك بوونەوە حەڵاڵە ئەگەر ئافرەتەکە شوێنی خوێنەکەی داپۆشت (واتە عەوڕەتی).

١٠٨٦ ـ لە أم سلمة ـ رضي الله عنها ـ گێردراوتەوە، ووتویەتی : لەگەڵ رسول الله ـدا ـ صلى الله عليه وسلم ـ لە یەك پێخەفدا بووم، منیش ئەوەم بینی کە ئافرەتان دەیبینن، بۆیە هەڵسام، رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرمووی : ئایا تووشی سوڕی مانگانە بووی؟
ووتم : ئەوەم بینی کە ئافرەتان دەیبینن، فەرمووی : ئەوە شتێکە الله تعالى لەسەر کچانی ئادەمی نوسیوە (دەبێ بەسەریان بێت)،
دەڵێ : جا هەڵسام و کاروبارەکەی خۆمم ڕێك خست، دواتر گەڕامەوە، رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرمووی : بچۆرە ژێر پێخەفەکە (وەرە بۆ لام بۆ ناو پێخەفەکە)، منیش چووم.

١٠٨٨ ـ لە میمونة ـ رضي الله عنها ـ گێردراوەتەوە، ووتویەتی : هەموو جار رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ لە ئافرەتەکانی نزیك دەکەوتەوە لەسەرەوەی ناو قەد لە کاتێکدا کە خێزانەکەی حیض ـدار بوو.

١٠٨٩ ـ لە دایکە عائشة ـوە ـ رضي الله عنها ـ گێردراوەتەوە، ووتویەتی : هەموو جار رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرمانی بە یەکێك لە ئێمە دەکرد ئەگەر حیض ـدار بووایە کە جلی خوارەوەی چاك لەسەر خۆی قایم بکات، دواتر لێی نزیك دەکەوتەوە.

تێبینی / بۆ زانینی بەڵگەیی زیاترر بگەڕێنەوە بۆ کتابی سنن ـی الدارمی، لاپەڕە (٣٥٤).

## |باسی حوکمی جووت بوون لەگەڵ ئافرەتی حیض ـدار کاتێ پاك دەبێتەوە پێش ئەوەی خۆی بشۆرێ |

١١١٩ - لە مجاهد گێردراوەتەوە، دەربارەیی ئافرەتی حیض ـدار کاتێ لە خوێن پاك دەبێتەوە،
ووتویەتی : هاوسەرەکەی لێی نزیك ناکەوێتەوە (جیماعی لەگەڵ ناکات) تا خۆی دەشۆرێت.

١١٢١ - لە محمد بن یوسف ـوە گێردراوەتەوە، ووتویەتی : پرسیار لە ئیمامی سفیان کرا کە ئاخۆ (درووستە) پیاو جیماع لەگەڵ خێزانی بکات ئەو کاتەیی خوێنی دەپچڕێ ( لە خوێن پاك دەبێتەوە) پێش ئەوەی خۆی بشۆرێت (واتە غوسڵ دەرکات)؟
ووتی : نەخێر درووستت نییە،
پێی ووترا : ئەی بۆچوونت چۆنە ئەگەر ئافرەتەکە خۆی نەشۆرد دوو ڕۆژ یان چەند ڕۆژێك؟
ووتی : داوایی تەوبەی لێ دەکرێت(خۆی زۆر تاوانبار کردووە، چونکە نوێژەکانی فەوتاندووە).

١١٢٣ - لە مجاهد ـەوە گێردراوەتەوە، دەربارەیی ئەو ئایەتەیی الله تعالی دەفەرمووێت : {حَتَّى يَطْهُرْنَ} [سورة البقرة (٢٢٢)]
واتە {وە لە ئافرەتەکانتان نزیك مەکەونەوە (جیماعیان لەگەڵ مەکەن) تا پاك دەبنەوە}؟
ووتی : مەبەستی لە ڕستەی (تا پاك دەبنەوە) ئەوەیە : تا خوێن دەپچڕێت،
وە دەربارەیی بەشەکەیی تری ئایەتەکە کە دەفەرمووێت : {فَإِذَا تَطَهَّرْنَ} [سورة البقرة(٢٢٢)]
واتە {جا کاتێك باش پاك و خاوێن بوونەوە}
ووتویەتی : واتە کاتێك خۆیان دەشۆرن.

١١٢٦ - لە الحسن ـەوە گێردراوەتەوە، دەربارەیی ئەو پیاوەی جیماع لەگەڵ ئافرەتەکەی دەکات پێش ئەوەی خۆی بشۆرێت لە کاتێکدا پاکیەتی بینیوە؟
ووتویەتی : هەر حیض ـدارە (هەر بە حیض حیسابە)، مادەم خۆی نەشۆردووە، وە پیاوەکە (ئەگەر بچێتە لای و سەرجێی لەگەڵ بکات) کەفارەتیشی لەسەرە، وە (ئەگەر تەڵاقێك یان دووانی دابێت) بۆی هەیە بیگەڕێنێتەوە مادەم هێشتان خۆی نەشۆردووە.

١١٢٧ - لە الحسن ـەوە گێردراوەتەوە، ووتویەتی : هاوسەرەکەی جیماعی لەگەڵ ناکات (پێش خۆشۆردن).

١١٢٩ - لە عطاء ـەوە گێردراوەتەوە، دەربارەی ئەو ئافرەتەی پاك بوونەوە دەبینێت (ئایا درووستە) پیاوەکەیی بچێتە لای جیماعی لەگەڵ بکات، پێش ئەوەی خۆی بشۆرێت؟
ووتی : نـەخێر درووست نییە، تا خۆی دەشۆرێت.

[سنن الدارمي، مجلد (١) (لا : ٣٦٠) إسناده صحيح]

## | باسی پیاو بچێتە لای خێزانی (بۆ جیماع) لە کاتێکدا کە لە حیض ـدایە حوکمی چییە؟ |

### ئەو زانایانەیی ووتویانە کەفارەتی لەسەرە :

١١٤٦ - لە یزید بن إبراهیم گێردراوەتەوە، ووتویەتی : گوێم لە حسن بوو دەربارەیی ئەو کەسەی ڕۆژێك لە ڕەمەزان دەشکێنێت؟
ووتی : ئازاد کردنی بەندەیەکی لەسەرە یان کردنە خێری وشترێك، یان کردنە خێری صاعێك لە دانەوێڵە بۆ چل هەژار، وە دەربارەیی ئەو کەسەیی جیماع لەگەڵ خێزانەکەی دەکات لە کاتێکدا کە حیض ـدارە بە هەمان شێوە (کافارەتەکەی وەك پێشەوەیە).

١١٤٨ - لە ابن عباس ـوە ـ رضي الله عنهما ـ گێردراوەتەوە، دەربارەیی ئەو کەسەی دەچێتە لای خێزانەکەی و (جیماعی لەگەڵ دەکات) لە کاتێکدا کە لە حیض ـدایە؟
ووتویەتی : دینارێك (واتە یەك مسقاڵ زێڕ) یان ووتی : نیو دینار (واتە نیو مسقاڵ زێڕ) دەکاتە خێر،
الحکم گومانی هەبووە کە کامیانی ووتوە.

١١٤٩ - لە ابن عباس ـوە ـ رضي الله عنهما ـ گێردراوەتەوە، دەربارەیی ئەو کەسەی جیماع لەگەڵ خێزانەکەی دەکات لە کاتێکدا کە لە حیض ـدایە، دینارێك (مسقاڵە زێڕێك) یان نیو دینار (نیو مسقاڵ زێڕ) دەکات بە خێر، شعبة ووتویەتی : ئەوەی من لەبەرم کردوە (دەربارەیی ئەم فەرموودەیە) ئەوە لە رسول الله ـوەیە ـ صلی الله علیه وسلم ـ (فەرموودەکە پاڵ دراوەتەوە لای ئەو) هەرچی فلان و فلانیش ووتویانە : نە گەیشتۆتە رسول الله ـ صلی الله علیه وسلم ـ (قسەی ابن عباس ـە)، هەندێك لە خەڵکەکە ووتیان : ئەوەمان بۆ باس بکە کە خۆت لەبەرت کردوە واز بێنە لە قسەی فلان و فلان، ئەویش ووتی : سوێند بە خوا حەز ناکەم تەمەنم درێژ بکرێتەوە لە دوونیا بە تەمەنی نوح ـ علیه السلام ـ و ئەوەتان بۆ باس بکەم یان خۆم لەوە بێ دەنگ بکەم، (نەخێر دەبێ هەردووکیان باس بکەم و ڕوونی بکەمەوە).

١١٥١ - لە ابن عباس ـوە ـ رضي الله عنهما ـ گێردراوەتەوە، ووتویەتی : رسول الله ـ صلی الله علیه وسلم ـ دەربارەی ئەو کەسەی تووشی خێزانەکەی دەبێ و (جیماعی لەگەڵ دەکات) لە کاتێکدا کە لە حیض ـدایە؟ فەرمووی یەتی : نیو دینار (نیو مسقاڵ زێڕ) دەکاتە خێر.

١١٥٣ - لە ابن عباس ـوە ـ رضي الله عنهما ـ گێردراوەتەوە، ئەویش لە رسول الله ـوە ـ صلی الله علیه وسلم ـ گێڕاویەتیەوە فەرموویەتی : ئەگەر پیاو چوو بۆ لای خێزانەکەی و (جیماعی لەگەڵ کرد) لە کاتێکدا کە لە حیض ـدایە،

فەرمووی : ئەگەر لەو حاڵەتە بوو کە خوێنەکە گەش و زۆربوو (والله اعلم واتە سەرتایی سوڕی مانگانەی بوو) با دیناریك (مسقاڵێك زێڕ) بکاتە خێر، وە ئەگەر هاتوو زەردایەتی بوو ( والله اعلم واتە کۆتای سوڕی مانگانەی بوو) با نیو دینار (نیو مسقاڵ زێڕ)بکاتە خێر.

١١٥٦ - لە عطاء ـەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی پیاوێك کە جیماعی لەگەڵ خێزانەکەی کردبێت لە کاتێکدا کە حیض دارە؟
وتی : دیناریك (واتە مسقاڵە زێڕێك) دەکاتە خێر.

١١٥٨ - لە الأوزاعي ـەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەیی پیاوێك کە جیماع لەگەڵ خێزانەکەی دەکات لە کاتێکدا کە حیض ـدارە، یان پاك بۆتەوە و خۆی نەشۆردوە؟
وتی : داوای لێخۆشبوون لە الله تعالی دەکات و پێنج یەکی دینارێك (واتە پێنج یەکی مسقاڵێکی زێر) دەکات بەخێر.

[سنن الدارمي، مجلد (١) (لا : ٣٦٠، ٣٦٦) إسناده صحيح]

# دەروازەیی بــیست و یــــەکــــ

## | باسی حوکمی چوونە ناو مزگەوت بۆ ئافرەتی حیض دار |

١٢٠٦ ـ لە إبراهیم گێردراوەتەوە، ووتویەتی : هیچی تیانیە ئافرەتی حیض دار دەستی درێژبکات و شتێك ببات بۆ مزگەوت یان لێی دەربهێنێت.

١٢٠٨ ـ لە قتادة گێردراوەتەوە، ووتویەتی : کەسی جەنابەتدار شت هەڵدەگرێت و وەردەگرێت لە ناو مزگەوت، بەڵام نایباتە ناویەوە.

١٢٠٩ ـ لە عطاء ـەوە گێردراوەتەوە، دەربارەی حوکمی ئافرەتی حیض دار بە درێژ کردنی دەستی شت بهێنێت بۆ مزگەوت؟
ووتی : بەڵێ درووستە تەنها قورئان نەبێت(چونکە دروست نییە دەستی لێ بدات).

## | باسی حوکمی تێپەڕ بوونی کەسی جەنابەتدار بەناو مزگەوت |

١٢١٠ ـ لە ابن عباس ـ رضي الله عنهما ـ گێردراوەتەوە، دەربارەی فەرمایشتی الله تعالى : {وَلَا جُنُباً} واتە : {مەچنە مزگەوت و نوێژ مەکەن لە حاڵەتی بێ نوێژی تەنها عابیری سەبیل نەبێ}
واتە ووتویەتی : (عابیری سەبیل) واتە : موسافیر (واتە : بە بۆچوونی ابن عباس تەنها جەنابەتداری موسافیر بۆی هەیە بە مزگەوت ڕێ بکات و تێپەڕببێت).

## | باسی حوکمی ئافرەتی حیض دار کە خەنە دەکات، هەروەها ئەو ئافرەتەی نوێژ بە خەنەوە دەکات |

١١٣٥ - لە ابن عباس - رضي الله عنهما - گێردراوەتەوە، ووتویەتی : ئافرەتەکانی ئێمە شەوان خەنەیان بەکاردەهێنا، جا کە بەیانیان دەکردەوە (کە بەیانی دادەهات) خەنەکەیان لێدەکردەوەو دەست نوێژیان دەشۆردو نوێژیان دەکرد، دواتر خەنەیان بەکاردەهێنایەوە پاشی نوێژ، جا کە دەبووە کاتی نیوەڕۆ خەنەکەیان لادەبردو دەست نوێژیان دەشۆردو نوێژیان دەکرد بە باشترین خەنە کردن (ئەو جۆرە خەنە کردنە باشترین ڕێگایە) و ڕێگری لە نوێژ ناکات.

١١٣٦ - لە نافع ـەوە گێردراوەتەوە، کە خێزانەکانی ابن عمر - رضي الله عنهما - خەنەیان دەکرد لە کاتێکدا کە لە سوڕی مانگانەدابوون.

١١٣٧ - لە ابن عباس - رضي الله عنهما - گێردراوەتەوە، ووتویەتی : هەموو جار ئافرەتانی ئێمە کاتێ نوێژی عیشایان دەکرد خەنەیان بەکاردەهێنا، جا کە بەیانیان دەکردەوە (کە بەیانی دادەهات) لێیان دەکردەوە و دەست نوێژیان دەشۆرد و نوێژیان دەکرد، وە کاتێ نوێژی نیوەڕۆیان دەکرد (دووبارە) خەنەیان دەکرد، جا کاتێ بیانویستایە نوێژی عەسر بکەن لێیان دەکردەوە، خەنەکردنەکەیان جوان دەکرد (ئا بەو شێوەیە) و خۆیان لە نوێژ مەنع نەدەکرد.

[سنن الدارمي مجلد (١) (لا : ٣٦٣)]

# دەروازەیی بــیست و دوو

## | باسی دەربارەی عیددەی ئافرەتی مێرد مردوو و ئافرەتی تەڵاقدراو |

٢٣٣٠ ـ لە أبا سلمة بن عبد الرحمن ـەوە گێڕدراوەتەوە کە لەگەڵ ابن عباس ـ رضي الله عنهما ـ کۆبۆتەوە لەلای أبي هريرة ـ رضي الله عنه ـ و باسی ئەو پیاوەیانکردووە کە دەمرێت و خێزانی لەدووای خۆی جێدەهێڵێت و خێزانەکەشی دوای مردنی ئەو بە چەند شەوێکی کەم منداڵی دەبێت، جا إبن عباس ووتی : حەڵاڵ بوونی (بۆ شوکردنەوە و کۆتایی هێنانی عیددەکەی برییە لە) دووەمین ماوە (واتە : ئەگەر حەملەکەی پێشی چوار مانگ و دە ڕۆژ دانا، ئەوە هەر دەبێ چوار مانگ و دە ڕۆژ چاوەڕێ بکات ئەوجا مێرد بکاتەوە، وە ئەگەر حەملەکەی دوای زیاتر لە چوارمانگ و دە ڕۆژ دادەنا ئەوە دەبێ تا حەملەکەی دادەنێ بوەستێت، واتە : کار بە تاخیرەکەیان و زیاترەکەیان دەکرێت)،
أبو سلمة ـیش ووتی : نەخێر من پێم وایە عیددەکەی بریتیە لەو کاتەی حەملەکەی دادەنێت(جا زوو بێت یان دڕەنگ)، ئەوە عیددەکەی کۆتایی دێت، جا هەر باسوخواسیان بوو دەربارەی ئەو بابەتە،
أبي هريرة ـش ووتی : من لەگەڵ کوڕی برامم(واتە لەگەڵ ابو سلمە) جا کرییا خزمەتکاری ابن عباس ـیان نارد بۆ لای أم سلمە و پرسیاری لێکرد، جا أم سلمە باسی کرد، ووتی : سبيعة بنت الحارث ـی الأسلميە پیاوەکەی وەفاتی کرد و بە چەند شەوێك دوای مردنی هاوسەرەکەی منداڵی بوو، پیاوێکی بەنی عبد الدار کە پێی دەوترا أبو السنابل چووە داوای و پێی ڕاگەیاند کە مێرد کردنەوەی بۆ حەڵاڵ بووە(عیددەکەی کۆتای هاتووە)، جا ئافرەتەکەش ویستی شوو بەکەسێکی جگە لەوبکات، جا لەبەر حەسادەت ابو السنابل پێی ووت : تۆ حەڵاڵ نەبوویتەوە عیددەت تەواو نەبووە، جا سبيعە ئەوەی بۆ رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ باس کرد و رسول الله ـیش ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرمانی پێ کرد کە شوو

بکاتەوە(واتە : قسەی ابو سلمە دەرچوو کە ووتی عیددە بە دانانی حەملەکە کۆتایی دێت و حەڵاڵە شووبکاتەوە).

٢٣٣١ - لە أم سلمة ـوە - رضي الله عنها - گێردراوەتەوە، ووتویەتی : هاوسەری سبیعە بنت الحارث وەفاتی کرد وپاش وەفات کردنی هاوسەرەکەی بە چەند ڕۆژێك منداڵی بوو، جا رسول الله - صلی الله علیە وسلم - فەرمانی پێ کرد کە شووبکاتەوە.

٢٣٣٢ - لە أبي السنابل - رضي الله عنە - گێردراوەتەوە، ووتویەتی : سبیعە بنت الحارث منداڵی بوو پاش وەفات کردنی هاوسەرەکەیی بە بیست و هەندێك شەو، جا کە خوێنی منداڵ بوونی وەستا و خۆی جوان کرد(بۆ زەواجکردن) لەسەر ئەوە عەیبدار کرا و ڕەخنەی لێگیرا، جا بابەتەکە بۆ رسول الله - صلی الله علیە وسلم - باس کرا،
رسول الله ـیش - صلی الله علیە وسلم - فەرمووی : ئەگەر وابکات (واتە بیەوێت شووبکاتەوە) ئەوە ماوەکەی تەواوبووە (واتە : عیددەکەی تەواو بووە، دەتوانێت شووبکاتەوە و کێشەنییە).

٢٣٣٣ - لە الأسود ـەوە گێردراوەتەوە، ووتویەتی : سبیعە پاش وەفات کردنی هاوسەرەکەیی بە چەند ڕۆژێك منداڵی بوو و خۆیی ڕازاندەوە و أبو السنابل ڕەخنەی لێگرت، جا سبیعە پرسیاری لە رسول الله - صلی اللهعلیە وسلم - کرد یان بابەتی سبیعە ـی بۆ باسکرد، رسول الله ـیش - صلی الله علیە وسلم - فەرمانی پێ کرد شووبکاتەوە.

[سنن الدارمي، إسنادە صحيح، لا(٢٣٣,٢٣٤)]

# دەروازەیی بــیست و سێ

## | خواردنی دەرمان بۆ ڕاگرتنی حیض تا لە مانگی ڕەمەزان تووشی حیض نەبیت و ڕۆژووەکەت هەمووی بگریت، تا چەند ئەم دەرمانە دروستە بەکار بهێنرێت؟ |

وەڵام : گەر دەرمانەکە ناسراو بێت و بێ زیان بێت و حەیضی ئافرەتەکە تێك نەدات و تووشی کێشەی سوڕی مانگانەی نەکات جائیزە و حەرام نیە، ئەما بەکار نەهێنانی باشترو چاکترە چونکە شتێکە الله دایناوە بۆت و وا باشترە کە دەستکاری نەکەیت و لێی بگەڕێیت تا لەسەر ڕێڕەوی خۆی بڕوات، وە بێگومان هەندێك لە زانایان پێیان خراپ بووە کە بەکار بهێنرێت و حەیضی پێ دوا بخرێت لەکاتی خۆی، دواتر دەچینە سەر ووتەی زانایان .

ئیمامی عبدالرزاق لە مصنف بابێکی داناوە لەسەر ئەمە بەناوی :
[ (١٠) باب الدواء يقطع الحيضة]

واتە: دەرمان بۆ وەستاندنی حەیض.

١٢١٩- أَخْبَرَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ، قَالَ:
سُئِلَ عَطَاءٌ، عَنِ امْرَأَةٍ تَحِيضُ يُجْعَلُ لَهَا دَوَاءٌ فَتَرْتَفِعُ حَيْضَتُهَا، وَهِيَ فِي قُرْئِهَا كَمَا هِيَ تَطُوفُ؟ قَالَ:
نَعَمْ، إِذَا رَأَتِ الطُّهْرَ فَإِذَا هِيَ رَأَتْ خُفُوقًا وَلَمْ تَرَ الطُّهْرَ الأَبْيَضَ فَلاَ.

ابْنُ جُرَيْجٍ دەڵێت : پرسیار کرا لە عطاء دەربارەی ئافرەتێك کە خوێنی حەیضی هەیە و دەرمانی بۆ بەکار دەهێندرێ وحەیضەکەی ڕا دەوەستێت، وە ئەو لە کاتی عیددەدایە طەواف دەکات؟
ووتی : بەڵێ گەر بینی پاك بۆتەوە، بەڵام گەر بینی خوێنەکەی وشك بۆتەوە بەڵام ئەو ئاوە سپیەی نەبینی کە پاك دەبێتەوە ئەوا طەواف ناکات .

١٢٢٠ـ أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ قَالَ: أَخْبَرَنَا وَاصِلٌ مَوْلَى ابْنِ عُيَيْنَةَ، عَنْ رَجُلٍ، سَأَلَ ابْنَ عُمَرَ عَنِ امْرَأَةٍ تَطَاوَلَ بِهَا دَمُ الْحَيْضَةِ فَأَرَادَتْ أَنْ تَشْرَبَ دَوَاءً يَقْطَعُ الدَّمَ عَنْهَا، فَلَمْ يَرَ ابْنُ عُمَرَ بَأْسًا، وَنَعَتَ ابْنُ عُمَرَ مَاءَ الْأَرَاكِ.
قَالَ مَعْمَرٌ: وَسَمِعْتُ ابْنَ أَبِي نَجِيحٍ يُسْأَلُ عَنْ ذَلِكَ فَلَمْ يَرَ بِهِ بَأْسًا.

پیاوێك پرسیار له ابن عمر ـ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما ـ كرد، دەربارەی ئافرەتێك كه خوێنی حەیضی زۆر بووه و ماوەكەی درێژ بۆتەوه وه دەیەوێ دەرمان بخوات تاكو خوێنەكەی بوەستێت،
ابن عمر پێی وابوو هیچی تێدا نییه و جائیزه وه ابن عمر باسی ئاوی ( الاراك ) ـی بۆ كرد وەك دەرمان بەكاری بهێنێت .

مَعْمَر دەڵێت : بیستم ابْنَ أَبِي نَجِيحٍ پرسیاری لێكرا دەربارەی ئەوه پێی وابوو هیچی تێدا نیه و جائیزه .

[مصنف عبدالرزاق]

**مەزهەبی ئیمام أحمد و حەنابیله :**

قال إسحاق بن منصور: قلت: المرأةُ تشربُ دواءً يقطعُ الدمَ عنها؟
قال: إذا كان دواء يعرف فلا بأسَ به.
قال إسحاق: كلما لم تُرد بذلك إسقاط ما في البطنِ فلا بأس به.

إسحاق بن منصور دەڵێت : ووتم : بە أحمد بن حنبل ئافرەتێك دەرمان دەخوات تا خوێنی حەیضەكەی بوەستێنێ ؟
ئیمام أحمد ووتی : ئەگەر هاتوو دەرمانەكه ناسراو بوو هیچی تێدا نیه بەكاری بێنێت .

إسحاق دەڵێت : هەر جارێك مەبەستی ئەوە نەبێت كە ئەوەی لەناو سكیەتی لەباری بخات هیچی تێدا نیە دەرمان بەكار بێنێت .
(واتە دەرمان بەکار نەهێنێت بۆ لەبار بردنی حەملەکەی تەنها بۆ وەستاندنی حەیض بێت ئاساییە)

[مسائل الكوسج]

قال ابن مفلح الحنبلي : نَصَّ أَحْمَدُ فِي رِوَايَةِ صَالِحٍ وَابْنِ مَنْصُورٍ فِي الْمَرْأَةِ تَشْرَبُ الدَّوَاءَ يَقْطَعُ عَنْهَا دَمَ الْحَيْضِ: إنَّهُ لَا بَأْسَ بِهِ إذَا كَانَ دَوَاءً يُعْرَفُ .

ابن مفلح الحنبلي دەڵێت : قسەی أحمد لە ڕیوایەتی صالح و ابن منصور لە بارەی ئافرەتێك دەرمان دەخوات تا خوێنی حەیضەکەی بوەستێنێ، ئەوەیە کە هیچی تێدا نیە ئەگەر هاتوو دەرمانەکە ناسراو بوو .

[الآداب الشرعية]

قال المرداوي : يجوزُ شُرْبُ دواءٍ مُباحٍ لقَطْعِ الحيضِ مُطلْقًا، مع أمْنِ الضَّرَرِ، على الصَّحيحِ مِنَ المذهبِ نصَّ عليه .

المرداوي دەڵێت : دروستە دەرمانێکی موباح بخوات بۆ وەستاندنی حەیض موطلقەن، لەگەڵ ئەوەی ئەمینە لە زیانەکانی، لەسەر ووتەی ڕاستی مەزهەب نەصی لەسەر هاتووە (واتە ئیمام أحمد ووتەی هەبووە لەسەری).

[الانصاف]

/ تێبینی : لە مەزهەبی ئیمام أحمد و حەنبەلیەکاندا ئەو دەرمانە جائیزە کە ناسراو بێت و بزانرێ چیە و زیانیشی نەبێت بۆ ئەو کەسەی کە بەکاری دێنێت، گەر زیانی هەبێت حەرامەو جائیز نیە، والله اعلم .

ثَنَا أَحْمَدُ، قَالَ: ثَنَا مُعَاذُ بْنُ مُعَاذٍ، عَنْ أَشْعَثَ، عَنِ الْحَسَنِ، أَنَّهُ قَالَ: فِي امْرَأَةٍ قَضَتِ الْمَنَاسِكَ كُلَّهَا إِلَّا الطَّوَافَ الْوَاجِبَ، ثُمَّ حَاضَتْ فَشَرِبَتْ دَوَاءً، فَقَطَعَ الدَّمَ عَنْهَا فَطَافَتْ فِي أَيَّامِ حَيْضَتِهَا وَهِيَ طَاهِرٌ؟ قَالَ: أَجْزَأَ عَنْهَا.

حەسەن بەصری دەڵێت : لە بارەی ئافرەتێك هەموو ڕێوڕەسمە سونەتەکانی حەجی جێبەجێ کردووە تەنها طەواف نەبێت کە واجبە، پاشان تووشی حەیض دەبێت دەرمان دەخوات، خوێنەکەی دەوەستێت و طەواف دەکات لەو ڕۆژانەی حەیضی هەیە وە ئەو پاکبۆتەوە؟ حەسەن ووتی : دروستە بۆی .

[مسائل الإمام أحمد رواية أبي داود السجستاني]

// ئەوەی تا ئێرە باسمان کرد مەزهەبی حەنبەلیەکان بوو لە ناویشیان گەورەی مەزهەب ئیمامی أحمد کە پێیان جائیز بووە دەرمان بەکار بێت بۆ دواخستنی حەیض ئەگەر دەرمانەکە ناسراو بێت و بێ زیان بێت .

بەڵام لە مەزاهیبی تر پێیان خراپ بووە دەرمان بەکار بێت بۆ دواخستنی کاتی حەیضەکە و پێیان باش بووە دەستکاری نەکرێت و بە شێوەی ئاسایی خۆی بڕوات وەك چۆن لای مالیکیەکان هاتووە :

قال ابن القاسمِ في "العُتْبِيَّة": قال مالكٌ في المرأة تريد العمرةَ بعدَ الحجِّ، وتخاف تعجيل الحيضة: فإني أكره أن تشرب دواءً لتأخير الحيضة.

ابن القاسم دەڵێت : ئیمامی مالیك دەربارەی ئافرەتێك دەیەوێت عومرە بکات دوای حەج، وە ترسی هەیە حەیضەکەی پێش بکەوێت : ئیمام مالیك پێی خراپ بوو کە دەرمان بخوات بۆ دواخستنی حەیضەکەی .

[النوادر والزيادات على ما في المدونة من غيرها من الأمهات]

قال ابن كنانة؛ يكره ما بلغني أن النساء يصنعنه ليتعجلن به الطهر من الحيض من شرب الشجر والتعالج بها وبغيرها.

ابن كنانة خوێندكاری ئیمامی مالیكه دەڵێت : پێم باش نیه ئەوەی گەشتووە پێم كه ئافرەتان دروستی دەكەن بۆ ئەوەی زوو پاك ببنەوە له حەیض له خواردنی ڕووەك و داو دەرمان وە غەیری ئەوانەش .

[البيان والتحصيل لابن رشد]

وسئل مالك عن المرأة تريد العمرة، فتخاف تعجيل الحيض، فيوصف لها شراب تشربه لتأخير الحيضة، قال: ليس ذلك بالصواب، وكرهه.

وە پرسیار كراوە له ئیمامی مالیك دەربارەی ئافرەتێك دەیەوێت عومرە بكات، دەترسێت حەیضەكەی پێش بكەوێت، هەوڵ ئەدات شەرابێت بخواتەوە تا حەیضەكەی دوا بخات، ئیمامی مالیك ووتی : ئەوە شتێكی ڕاست نیه، وە خراپە .

[البيان والتحصيل (٣/٤٦٠)]

// جا ئەمەی كه ئیمام مالیك دەڵێت ڕاست نیەو خراپە له ترسی ئەوەیە زیان بە لاشەی بگەیەنێت و سوڕی مانگانەی تێك بدات كە ئەمەش شتێكی خراپە بۆ ئافرەت، جا الله ئەو ماوەی داناوە بۆ حەیضی ئافرەت بێگومان سودی خۆیی هەیە جا بۆیە دەستكاری نەكرێت باشترو چاكترە، و الله هیچ شتێكی لەسەر مرۆڤ دانەناوە كه له توانای خۆی نەبێت، هیچ كێشەیەك نابێت با مانگی ڕەمەزان حەوت ڕۆژی لێ نەگریت لەبەر حەیضەكەت دواتر دەتوانی بیگریتەوەو هەمان پاداشتی ڕۆژووی مانگەكەشت بۆ هەیە، چونكە عوزرت هەبووە بۆ ئەوە، جا بۆیە هیچ پێویست ناكات خۆتان تووشی زیان بكەن بە خواردنی دەرمانێك كه له ئێستادا نازانرێ له چی دروست دەكرێت و چۆن چۆنیە، تا دوور بن لەو دەرمانانە باشترو چاكترە بۆ تەندروستی خۆتان، والله اعلم .

// تێبینی : به گشتی دەرمان بەكار هێنان بۆ دواخستنی حەیض حەرام نیه به مەرجێك دەرمانەكه ناسراو بێت و بێ زیان بێت گەر زیانی هەبێت بێ هیچ خیلافێك حەرامەو دروست نیه، بەڵام ئافرەتان هەرچەند خۆیان بپارێزن لەو دەرمانانه كه بۆ دواخستنی كاتی حەیض بەكار دێت باشتره بۆیان و سەلامەتتره جا بۆیه بۆ ئەوەی دوور بیت له زیانی ئەو دەرمانانه كه ناسراو نین و زۆر جار تووشی كێشەشت دەكەن بەكار نەهێنانیەتی و ڕێگه دانه به كاتی حەیضەكه تا به كاتی ئاسایی خۆیدا بڕوات و تووشی هیچ زیانێك نەبیت ، دواتر دەتوانیت ڕۆژووەكەت بگریتەوەو كاتێكی زۆرت لەبەر دەستدایه، هەمان پاداشتی ڕۆژووی ئەم مانگەشت بۆ دەنوسرێت به ئیزنی الله چونكه ئەوه به سەرتان دێت الله بۆی داناون و عوزرتان هەیه، والله اعلم .

# دەروازەیی بـــیست و چـــوار

## | باسی حوکمی چوونە لای ئافرەت لە دواوە (لە ڕێگای کۆمەوە) |

١١٦١ - لە ابن سابط ـەوە گێردراوەتەوە، ووتویەتی : پرسیارم لە حفصة بنت عبدالرحمن ابن أبي بكر، پێم ووت : من دەمەوێ پرسیارت لێ بکەم دەربارەی شتێك، وە شەرمیش دەکەم کە پرسیارت دەربارەی لێ بکەم؟
حفصة ووتی : پرسیار بکە ئەی برازام ئەوەی دەتەوێ،
ابن سابط ووتی : پرسیارت لێدەکەم دەربارەی (حوکمی) چوونە لای ئافرەت لە دواوە (لە ڕێگای کۆمەوە)؟
حفصة ووتی : أم سلمة - رضي الله عنها - بۆی گێڕامەوە ووتی : ئەنصاریەکان نەدەچوونە لای خێزانەکانیان لە دواوە وەك شێوازی سوجدە بردن لە لایەن ئافرەتەکەوە، موهاجیرەکانیش لە دواوە بە شێوازی سەجدە دەچوونە لای خێزانەکانیان (لە ئەندامی زاوزێوە لەشوێنی حەڵاڵەوە)، جا پیاوێك لە موهاجیرەکان هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتێك لە ئەنصاریەکان کرد، پیاوەکە بە شێوازی سەجدە چوو بۆ لای خێزانەکەی (لەڕێگای ئەندامی زاوزێ)ئافرەتە ئەنصاریەکە ڕازی نەبوو، بۆیە ئافرەتەکە (بۆ پرسیار کردن)هات بۆ لای ام سلمة - رضي الله عنها - ئەوەیی بۆ باس کرد، کاتێك رسول الله - صلى الله عليه وسلم - هات ئافرەتە ئەنصاریەکە شەرمی کردو چووە دەرەوە، ام سلمە ئەمەی بۆ رسول الله - صلى الله عليه وسلم - باسکرد،
رسول الله - صلى الله عليه وسلم - فەرمووی : ئافرەتەکەم بۆ بانگ بکەن، بۆیان بانگ کرد،
رسول الله - صلى الله عليه وسلم - ئەو ئایەتەی پێ فەرموو : { نِسَآؤُكُمۡ حَرۡثٞ لَّكُمۡ فَأۡتُواْ حَرۡثَكُمۡ أَنَّىٰ شِئۡتُمۡۖ } [سُورَةُ البَقَرَةِ: ٢٢٣]
واتە { ژنانی هاوسەرتان کێڵگەن بۆتان و شوێنی چاندنی وەچەن، جا بڕۆنە لای کێڵگەکانتان (خێزانەکانتان) بە هەر شێوەیەك کە دەتانەوێت}
یەك سیمام واتە : یەك ڕێگا.

تێبینی / ئایەتەکە باس لەوەدەکات کە پیاو دەتوانێ بە هەر شێوازێك هاوسەران پێیان خۆشە جووت ببن، بەڵام جووت بوونەکە تەنها لە ڕێڕەوی زاوزێ دروستە، بە هیچ شێوەیەك لە ڕێڕەوی کۆمەوە درووست نییە و تاوانێکی گەورەیە.

١١٦٣ ـ لە مجاهد ـەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەیی ئەو ئایەتە الله تعالى دەفەرمووێت : { فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُ } [سُورَةُ البَقَرَةِ: ٢٢٢]
واتە {بچنە لایان بەو شێوەیەیی الله تعالى فەرمانی داوە}
ووتویەتی : فەرمانیان پێ کراوە بچن بۆ لای خێزانەکانیان بەو شێوەیەی نەهیان لێ کرا(واتە چۆن نەهیان لێ کرا لەکاتی حیض بچنە لای خێزانەکانیان و جیماعیان لەگەڵ بکەن ئاواش فەرمانیان پێ کرا دوای پاك بوونەوە بچن بۆ لایان لەو شوێنەی حەڵاڵە و الله تعالى فەرمانی کردوە پێی).

١١٦٧ ـ لە علي بن علي الرفاعي ـەوە گێڕدراوەتەوە، ووتویەتی : گوێم لە الحسن بوو دەی ووت : جوولەکەکان کەمتەرخەمیان نەدەکرد لە هەر شتێك کە لەسەر مسوڵمانان قورس و ناخۆش بووایە(پێیان دەوتن و بۆیان باس دەکردن)،
دەیان ووت : ئەی هاوەڵانی محمد ـ صلى الله عليه وسلم ـ سوێند بە الله بۆتان حەڵاڵ نییە بچنە لای خێزانەکانتان تەنها لە یەك ڕوو بە یەك جۆر نەبێت،
دەڵێ : الله تعالى ئەو ئایەتەی دابەزاند { نِسَآؤُكُمۡ حَرۡثٞ لَّكُمۡ فَأۡتُواْ حَرۡثَكُمۡ أَنَّىٰ شِئۡتُمۡۖ } [سُورَةُ البَقَرَةِ: ٢٢٣]
واتە { ژنانی هاوسەرتان کێڵگەن بۆتان و شوێنی چاندنی وەچەن، جا بڕۆنە لای کێڵگەکانتان (خێزانەکانتان) بە هەر شێوەیەك کە دەتانەوێت }
الله تعالى ڕێگەی کردوە لە نێوان ئیمانداران و پێویستیەکەیان (بەوەی ئازادبن و بە هەموو شێوازێك بۆیان حەڵاڵ بێت بچنە لای خێزانەکانیان).

١١٦٩ ـ لە عكرمة ـەوە گێردراوەتەوە، ووتویەتی : پێشتر خەڵكی سەردەمی جاهیلی مامەڵەیان لەگەڵ ئافرەتی حیض ـداردا دەكرد وەك مامەڵەی ئاگر پەرستەكان (زۆر لێیان دوور دەكەوتنەوە، یان لە دواوە (لە رێگایی كۆمەوە) دەچوونە لایان)، جا ئەوەیان بۆ رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ باس كرد، ئەم ئایەتە دابەزی : { وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡمَحِيضِۖ قُلۡ هُوَ أَذٗى فَٱعۡتَزِلُواْ ٱلنِّسَآءَ فِي ٱلۡمَحِيضِ وَلَا تَقۡرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطۡهُرۡنَۖ } [سُورَةُ البَقَرَةِ: ٢٢٢]
واتە : {ئەی رسول الله پرسیارت لێ دەكەن دەربارەی عادەتی مانگانەی ئافرەتان (ئاخۆ بچن بۆ لایان بۆ جیماع كردن یان نا) پێیان بڵێ ئەوە ئازار و زەرەرە، كەوابوو خۆتان بە دوور بگرن لە هاوسەرەكانتان كە لەو حاڵەتەدا بن و نزیكیان مەكەون تا پاك دەبنەوە، جا كاتێك پاك بوونەوە خۆیان شۆرد بچنە لایان بەو شێوەی الله تعالى فەرمانی داوە } جا ئەمڕۆ فەرمانەكە هیچی بۆ ئافرەتەكان زیاد نەكرد تۆندی نەبێت.

١١٧١ ـ لە قتادة ـوە گێردراوەتەوە، دەربارەیی ئایەتی {قُل هُوَ أَذىً}
واتە {أذى} شتی قێزەون و پیسە.

١١٧٣ ـ لە الحسن ـەوە گێردراوەتەوە، ووتویەتی : (كَيْفَ شِئْتَ) واتە : بڕۆ بۆ لای سەر جێیی لەگەڵ بكە لە ئەندامی زاوزێوە (هەرچۆنی دەتانەوێ).

١١٧٤ ـ لە جابر بن عبد الله الأنصاري ـ رضي الله عنهما ـ گێردراوەتەوە، كە جوولەكەكان بە موسڵمانانیان ووت : هەر كەسێك بچێتە لای ئافرەتەكەی لە كاتێكدا ئافرەتەكە پشتی لەو بێت (واتە لە دواوە جیماعی لەگەڵ بكات لە ئەندامی زاوزێوە) ئەوە منداڵەكەی خێل دەبێت (بەخێلی لە دایك دەبێت)، الله تعالى ئەو ئایەتەی دابەزاند كە دەفەرمووێت : { نِسَآؤُكُمۡ حَرۡثٞ لَّكُمۡ فَأۡتُواْ حَرۡثَكُمۡ أَنَّىٰ شِئۡتُمۡۖ} [سُورَةُ البَقَرَةِ: ٢٢٣]

١١٧٥ - لە عكرمة ـەوە گێڕوودراوەتەوە، دەربارەی ئەو ئایەتە {فَأْتُوا۟ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ} [سُورَةُ البَقَرَةِ: ٢٢٣]
ووتویەتی : پیاو دەچێتە لای خێزانەکەی (سەرجێیی لەگەڵ دەکات) هەر چۆنی بوویت بە وەستاوی و بە دانیشتن و لەپێش و دوواوە (بەڵام لە ئەندامی زاوزێوە کە الله تعالی حەڵاڵی کردووە).

١١٧٦ - لە إبراهیم ـەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی ئایەتی { فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُ } [سُورَةُ البَقَرَةِ: ٢٢٢]
واتە : {بچنە لایان بەو شێوەیەیی الله تعالی فەرمانی داوە}
ووتویەتی : ئەوەی الله تعالی فەرمانی داوە جیماع کردنە لە ئەندامی زاوزێوە.

## | باسی خۆشۆردنی ئافرەتی حیض دار ئەگەر خۆشۆردنی لەسەر واجب بوو( بەهۆی جیماع یان ئیحتیلام) پێش ئەوەی تووشی حیض بێت |

١١٨٨ - لە عطاء و زهري ـەوە گێڕدراوەتەوە، ووتویانە : خۆشۆردن لە جەنابەت و حیض یەك جارە (واتە ئەگەر ئافرەتێك تووشی جەنابەت بوو دواتر ڕاستەوخۆ یان پاش کەمێك تووشی حیض ـیش بوو، ئەوە یەك جار واجبە خۆی بشۆرێت، ئەو کاتەی کە لە حیض ـەکەی پاك بوویەوە.

٧٥٥٥- أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: تُفْطِرُ الْحَامِلُ الَّتِي فِي شَهْرِهَا، وَالْمُرْضِعُ الَّتِي تَخَافُ عَلَى وَلَدِهَا تُفْطِرَانِ، وَتُطْعِمَانِ كُلَّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا كُلَّ يَوْمٍ مِسْكِينًا، وَلاَ قَضَاءَ عَلَيْهِمَا.
قَالَ مَعْمَرٌ: وَأَخْبَرَنِي مَنْ سَمِعَ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ يَقُولُ: إِنْ لَمْ تَسْتَطِيعَا الصِّيَامَ فَلْتُطْعِمَا.

سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ دەڵێت : ئافرەتی دووگیان ڕۆژووەکەی دەشکێنێ ئەگەر هاتوو لە مانگی خۆیدا بوو(واتە لە نزیکی منداڵ بوون بوو یان لە کاتێك بوو منداڵەکەی پێویستی بە خواردن بوو)، وە ئافرەتی شیردەر ئەگەر ترسی هەبوو لەسەر منداڵەکەی ڕۆژووەکەی دەشکێنێ، وە خواردن دەدەن

بۆ هەر ڕۆژێك بۆیان هەژارێك تێر دەكەن، وە قەزا كردنەوەیان لەسەر نیە .

مَعْمَرٌ دەڵێت : وە هەواڵیان پێداوم كە بیستویانە الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ دەیووت : ئەگەر نەیان توانی ڕۆژوو بگرن ڕۆژووەكەیان دەشكێنن .

٧٥٥٦- عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ قَتَادَةَ، قَالَ: تُفْطِرُ الْحَامِلُ الَّتِي تَخَافُ عَلَى وَلَدِهَا، وَتُفْطِرُ الْمُرْضِعُ الَّتِي تَخَافُ عَلَى وَلَدِهَا، وَتُطْعِمُ كُلُّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا كُلَّ يَوْمٍ مِسْكِينًا، وَلاَ قَضَاءَ عَلَيْهِمَا.

قَتَادَةَ دەڵێت : ئافرەتی دووگیان ئەگەر ترسی لەسەر منداڵەكەی هەبوو ڕۆژووەكەی دەشكێنێ وە ئافرەتی شیردەریش ئەگەر ترسی لەسەر منداڵەكەی هەبوو ڕۆژووەكەی دەشكێنێ، وە خواردن دەدەن بۆ هەر ڕۆژێك بۆیان هەژارێك تێر دەكەن، وە قەزا كردنەوەیان لەسەر نیە .

٧٥٥٧- عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنْ عَطَاءٍ، قَالَ: تُفْطِرُ الْحَامِلُ، وَالْمُرْضِعُ فِي رَمَضَانَ إِذَا خَافَتَا عَلَى أَوْلاَدِهِمَا فِي الصَّيْفِ قَالَ: وَفِي الشِّتَاءِ إِذَا خَافَتَا عَلَى أَوْلاَدِهِمَا.

عَطَاءٍ دەڵێت : ئافرەتی دووگیان و شیردەر ڕۆژووەكەیان دەشكێنن لە ڕەمەزاندا ئەگەر هاتوو ترسیان هەبوو لەسەر منداڵەكانیان لە هاویندا، دەڵێت : وە لە زستانیشدا ئەگەر ترسیان هەبوو لەسەر منداڵەكانیان .

٧٥٥٨- عَنْ مَعْمَرٍ، وَابْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَجْلاَنَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ لُبَيْبَةَ قَالَ: أَرْسَلَنِي عَبْدُ اللهِ بْنُ عَمْرٍو ابْنُ عُثْمَانَ إِلَى ابْنِ عُمَرَ أَسْأَلُهُ عَنِ امْرَأَةٍ أَتَى عَلَيْهَا رَمَضَانُ وَهِيَ حَامِلٌ قَالَ: تُفْطِرُ وَتُطْعِمُ كُلَّ يَوْمٍ مِسْكِينًا.

مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ لُبَيْبَةَ دەڵێت : عَبْدُ اللهِ بْنُ عَمْرٍو ابْنُ عُثْمَانَ ناردمی بۆ لای ابْنِ عُمَر ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما ـ پرسیارم لێی كرد دەربارەی ئافرەتێك

دەگات بە ڕەمەزان و دووگیانە، فەرمووی : ڕۆژووەکەی دەشکێنێ و بۆ هەر ڕۆژێك خواردنی هەژارێك دەدات .

٧٥٦١- عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: الْحَامِلُ إِذَا خَشِيَتْ عَلَى نَفْسِهَا فِي رَمَضَانَ تُفْطِرُ، وَتُطْعِمُ، وَلاَ قَضَاءَ عَلَيْهَا.

ابْنِ عُمَر ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما ـ دەڵێت : ئافرەتی دووگیان ئەگەر ترسی لەسەر نەفسی خۆی هەبوو لە ڕەمەزاندا ڕۆژووەکەی دەشکێنێ، وە خواردن دەدات لەبری ، وە قەزاکردنەوەی لەسەر نیە .

٧٥٦٢- عَنِ الثَّوْرِيِّ، عَنْ حَمَّادٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: تُفْطِرُ وَتُطْعِمُ نِصْفَ صَاعٍ.

إِبْرَاهِيم دەڵێت : ڕۆژوو دەشکێنن و نیو صاع خواردن دەدەن بۆ هەر ڕۆژێك .

٧٥٦٣- عَنْ مَنْ سَمِعَ عِكْرِمَةَ يَقُولُ: يُفْطِرُ الْحَامِلُ وَالْمُرْضِعُ فِي رَمَضَانَ، وَتَقْضِيَانِ صِيَامًا، وَلاَ طَعَامَ عَلَيْهِمَا.

عِكْرِمَة دەڵێت : ئافرەتی دووگیان و شیردەر ڕۆژوو دەشکێنن لە ڕەمەزاندا، وە ڕۆژووەکەیان قەزا دەکەنەوە، وە خواردن دانیان لەسەر نیە .

٧٥٦٤- عَنِ الثَّوْرِيِّ، وَ- عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: تُفْطِرُ الْحَامِلُ وَالْمُرْضِعُ فِي رَمَضَانَ، وَتَقْضِيَانِ صِيَامًا، وَلاَ تُطْعِمَانِ.

ابْنِ عَبَّاسٍ ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما ـ دەفەرموێت : ئافرەتی دووگیان و شیردەر ڕۆژوو دەشکێنن لە ڕەمەزاندا، وە ڕۆژووەکەیان قەزا دەکەنەوە، وە خواردن نادەن .

٧٥٦٦- عَنْ فُضَيْلٍ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى عَلْقَمَةَ فَقَالَتْ: إِنِّي حُبْلَى، وَإِنِّي أُطِيقُ الصِّيَامَ، وَإِنَّ زَوْجِي يَمْنَعُنِي، فَقَالَ لَهَا عَلْقَمَةُ: أَطِيعِي رَبَّكَ، وَاعْصِي زَوْجَكِ.

إِبْرَاهِيم دەڵێت : ئافرەتێك هاتە لای عَلْقَمَة پێی وت: من دووگیانم، وە من ئەتوانم بە ڕۆژوو بم، وە هاوسەرەکەم ڕێگریم لێ دەکات،
عَلْقَمَة پێی ووت : گوێڕایەڵی پەروەردگارت بکەو بەقسەی هاوسەرەکەت مەکە .

٧٥٦٧- عَنِ ابْنِ التَّيْمِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ؛ أَنَّهُ كَانَ يَأْمُرُ وَلِيدَةً لَهُ حُبْلَى أَنْ تُفْطِرَ لَهُ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ.

وَقَالَ: أَنْتِ بِمَنْزِلَةِ الْكَبِيرِ لاَ يُطِيقُ الصِّيَامَ، فَأَفْطِرِي، وَأَطْعِمِي عَنْ كُلِّ يَوْمٍ نِصْفَ صَاعٍ مِنْ حِنْطَةٍ.

سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ دەگێڕێتەوە لە ابْنِ عَبَّاسٍ ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما ـ کە فەرمانی کردووە بە کەنیزەکەکەی کە دووگیان بوو کە ڕۆژووەکەی بشکێنێت لە مانگی ڕەمەزاندا .

وە فەرمووی : تۆ بە هاوشێوەی کەسانی بەتەمەنی ناتوانن ڕۆژوو بگرن، ڕۆژووەکەیان دەشکێنن، وە خواردن دەدەن بۆ هەر ڕۆژێك نیو صاع لە گەنم .

[مصنف عبدالرزاق]

حَدَّثَنَا أَبُو صَالِحٍ , ثنا أَبُو مَسْعُودٍ , ثنا أَبُو عَامِرٍ الْعَقَدِيُّ , ثنا هِشَامٌ , عَنْ قَتَادَةَ , عَنْ عَزْرَةَ , عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ , عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ " أَنَّهُ كَانَتْ لَهُ أَمَةٌ تُرْضِعُ فَأُجْهِضَتْ , فَأَمَرَهَا ابْنُ عَبَّاسٍ أَنْ تُفْطِرَ يَعْنِي: وَتُطْعِمَ وَلَا تَقْضِيَ ".

سَعِيدِ بْنُ جُبَيْرٍ دەگێڕێتەوە لە ابْنَ عَبَّاسٍ ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما ـ کە کەنیزەکێکی هەبوو منداڵی هەبوو شیری دەدا زۆر نارەحەت بوو،
ابْنَ عَبَّاسٍ فەرمانی پێکرد کە ڕۆژووەکەی بشکێنێ واتە فیدیەی بدات بەخۆراك وەنەشی گرێتەوە .

[سنن الدارقطني (٢٣٨٤)]

حَدَّثَنَا أَبُو صَالِحٍ الْأَصْبَهَانِيُّ , ثنا أَبُو مَسْعُودٍ , ثنا الْحَجَّاجُ , ثنا حَمَّادٌ , عَنْ أَيُّوبَ , عَنْ نَافِعٍ , عَنِ ابْنِ عُمَرَ , أَنَّ امْرَأَتَهُ , سَأَلَتْهُ وَهِيَ حُبْلَى , فَقَالَ: «أَفْطِرِي وَأَطْعِمِي عَنْ كُلِّ يَوْمٍ مِسْكِينًا وَلَا تَقْضِي»

نافع دەگێڕێتەوە لە ابْنِ عُمَر ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما ـ کە خێزانەکەی دووگیان بووەو پرسیاری لێکردووە دەربارەی ڕۆژووی ئافرەتی دووگیان، ئەویش لەوەڵامدا فەرموویەتی : ڕۆژووەکەت بشکێنەو ڕۆژوو مەگرە، فیدیەی بدە بۆ هەر ڕۆژێك خواردنی هەژارێك بدەو قەزای مەکەرەوە .

[سنن الدارقطني ( ٢٣٨٨)]

ثنا أَبُو صَالِحٍ , ثنا أَبُو مَسْعُودٍ , ثنا أَبُو أُسَامَةَ , عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ , عَنْ نَافِعٍ , قَالَ: كَانَتْ بِنْتٌ لِابْنِ عُمَرَ تَحْتَ رَجُلٍ مِنْ قُرَيْشٍ وَكَانَتْ حَامِلًا فَأَصَابَهَا عَطَشٌ فِي رَمَضَانَ , فَأَمَرَهَا ابْنُ عُمَرَ «أَنْ تُفْطِرَ وَتُطْعِمَ عَنْ كُلِّ يَوْمٍ مِسْكِينًا»

نَافِعٍ دەڵێت : ابْنِ عُمَر ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما ـ کچێکی شووی کردبوو بەپیاوێك لەقوڕەیش دووگیان بوو، ڕۆژێك لەڕەمەزان دا تووشی تینوێتییەکی زۆربوو، ابْنِ عُمَر فەرمانی پێکرد ڕۆژووەکەی بشکێنێ و نەیگرێ لەجیاتیدا بۆ هەر ڕۆژێك خواردنی هەژارێك بدات .

[سنن الدارقطني (٢٣٨٩)]

// تێبینی : ئافرەتی دووگیان و شیردەر گەر ترسیان هەبوو لەسەر نەفسی خۆیان یان منداڵەکەیان ئەوا ڕۆژوو ناگرن و دواتر گەر ویستیان دەتوانن قەزای بکەنەوە، گەر نەیان ویست قەزای بکەنەوە دەتوانن بۆ هەر ڕۆژێك نیو صاع خواردن بدەن بە هەژاران لە خواردنی قووتی خەڵکەکە لەسەردەمی هاوەڵان زیاتر (گەنم) بووە بۆیە ابن عباس دەڵێت گەنم بدەن، لە ئێستاشدا زیاتر برنجە بۆیە ئەتوانن برنج بدەن گەر خواردنی تریشی لەگەڵ دابنێن زیادە شتێکی باشە، والله اعلم .

# دەروازەیی بـــیست و پێنج

## | دەربارەی ئافرەتی دووگیان و ئافرەتی شیردەر |

ئایا ئەو ئافرەتانەی دووگیانن یان شیردەدەن بە منداڵەکانیان ئەتوانن بە ڕۆژوو نەبن و دواتر بیگرنەوە یان فیدیەی بدەن بێ گرتنەوە؟

وەڵام : ئەگەر ئافرەتی دووگیان ترسی لەسەر منداڵەکەی هەبوو کە شتێکی لێ بێت و زیانی پێ بگات، یان ئافرەتی شیردەر منداڵەکەی هیچی نەدەخوارد شیری خۆی نەبێت و گەر شیری پێ نەدات تووشی زیان ببێ، ئەوا لەم حاڵەتانە ئەتوانن ڕۆژوو نەگرن .

گرتنەوەی یان نەگرتنەوەی لای زانایان خیلافی لەسەرەو هەندێکیان دەڵێن : دەتوانن ڕۆژوو نەگرن و دواتر تەنها فیدیەی بدەن،
هەندێکی تریش دەڵێن : دەبێ بە ڕۆژوو نەبن و دواتر قەزای بکەنەوە .

ئیمامی الترمذي لە سنن ـەکەیدا بابێکی داناوە بەناوی :
( الرُّخْصَةُ فِي الْإِفْطَارِ لِلْحُبْلَى وَالْمُرْضِعِ )

واتە: ڕێگە دراوە ئافرەتی دووگیان و شیردەر بەڕۆژوو نەبن .

حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ ، وَيُوسُفُ بْنُ عِيسَى ، قَالَا : حَدَّثَنَا وَكِيعٌ ، قَالَ : حَدَّثَنَا أَبُو هِلَالٍ ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَوَادَةَ ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ - رَجُلٌ مِنْ بَنِي عَبْدِ اللَّهِ بْنِ كَعْبٍ - قَالَ : أَغَارَتْ عَلَيْنَا خَيْلُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَوَجَدْتُهُ يَتَغَدَّى، فَقَالَ : " ادْنُ فَكُلْ ". فَقُلْتُ : إِنِّي صَائِمٌ. فَقَالَ : " ادْنُ أُحَدِّثْكَ عَنِ الصَّوْمِ أَوِ الصِّيَامِ : إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى وَضَعَ عَنِ الْمُسَافِرِ الصَّوْمَ وَشَطْرَ الصَّلَاةِ، وَعَنِ الْحَامِلِ، أَوِ الْمُرْضِعِ الصَّوْمَ أَوِ الصِّيَامَ ". وَاللَّهِ، لَقَدْ قَالَهُمَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كِلَيْهِمَا، أَوْ إِحْدَاهُمَا، فَيَا لَهْفَ نَفْسِي أَنْ لَا أَكُونَ طَعِمْتُ مِنْ طَعَامِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

وَفِي الْبَابِ عَنْ أَبِي أُمَيَّةَ. حَدِيثُ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ الْكَعْبِيِّ حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَلَا نَعْرِفُ لِأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ هَذَا عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غَيْرَ هَذَا الْحَدِيثِ الْوَاحِدِ. وَالْعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ الْعِلْمِ، وَقَالَ بَعْضُ أَهْلِ الْعِلْمِ : الْحَامِلُ، وَالْمُرْضِعُ تُفْطِرَانِ، وَتَقْضِيَانِ، وَتُطْعِمَانِ. وَبِهِ يَقُولُ سُفْيَانُ، وَمَالِكٌ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ. وَقَالَ بَعْضُهُمْ : تُفْطِرَانِ، وَتُطْعِمَانِ، وَلَا قَضَاءَ عَلَيْهِمَا، وَإِنْ شَاءَتَا قَضَتَا، وَلَا إِطْعَامَ عَلَيْهِمَا. وَبِهِ يَقُولُ إِسْحَاقُ.

<u>ئەنەسی کوری مالیك ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ ـ</u> پیاوێك بوو لە بەنی عبدالله بن کعب دەڵێت : کۆمەڵێ ئەسپ سواری پێغەمبەری الله ـ صلی الله علیه وسلم ـ دایان بەسەر قەومکەماندا، چووم بۆ خزمەت پێغەمبەری الله ـ صلی الله علیه وسلم ـ لەوکاتەدا خواردنی دەخوارد،
فەرمووی : دانیشە خواردنمان لەگەڵ بخۆ، ووتم : من بەڕۆژووم،
فەرمووی : دانیشە هەتا باسی نوێژ و ڕۆژووت بۆ بکەم، بەڕاستی الله عزوجل لەسەر موسافیر ڕۆژوو نیوەی نوێژی لاداوە، وە لەسەر ئافرەتی شیردەر و دووگیانیش ڕۆژووی هەڵگرتووە . ئەنەس دەڵێت : سوێند بە الله پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ ئافرەتی شیردەر و دووگیانی فەرموو یان یەکێکیانی فەرموو، زۆر بەداخەوەم لە خواردنەکەی پێغەمبەری الله ـ صلی الله علیه وسلم ـ نەخوارد .

<u>أبو عيسى الترمذي دەڵێت :</u> هەندێك لە ئەهلی عیلم کاریان بەم فەرموودەیە کردووە، وە هەندێك لە ئەهلی عیلم دەڵێن : ئافرەتی شیردەر و دووگیان بۆیان هەیە بەڕۆژوو نەبن وە لەپاشدا بیگرنەوەو خواردنیش بدەن بە هەژاران ، ئەمەش ووتەی، پێشەوایان (سُفْيَانُ، وَمَالِكٌ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَد ـه).
<u>هەندێکی تر لە ئەهلی عیلم دەڵێن :</u> ئافرەتی شیردەر و دووگیان بۆیان هەیە بەڕۆژوو نەبن و خواردن بدەن بە هەژاران، وە ڕۆژووگرتنەوەیان لەسەر نیە، ئەگەر ویستیان بیگرنەوە، خواردن دانیان بە هەژاران لەسەر نیە، ئەمەش ووتەی پێشەوا إِسْحَاق ـه .

[سنن الترمذي (٧١٥ )]

حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ ، حَدَّثَنَا أَبَانٌ ، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ ، أَنَّ عِكْرِمَةَ حَدَّثَهُ، أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ قَالَ : أُثْبِتَتْ لِلْحُبْلَى وَالْمُرْضِعِ.

ابن عباس ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما ـ دەفەرموێت: فیدیەدان و ڕۆژووشکاندنیان جێگیر و دامەزراوە بۆ ئافرەتانی دووگیان و شیر دەر .

[سنن أبي داود ( ٢٣١٧)]

عبدالرزاق لە مصنف بابێکی داناوە لەسەر ئەم بابەتە بەناوی :
[ (٣٠) باب الحامل والمرضع ]

واتە: دەربارەی ئافرەتی دووگیان و شیردەر .

٧٥٥٥- أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: تُفْطِرُ الْحَامِلُ الَّتِي فِي شَهْرِهَا، وَالْمُرْضِعُ الَّتِي تَخَافُ عَلَى وَلَدِهَا تُفْطِرَانِ، وَتُطْعِمَانِ كُلُّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا كُلَّ يَوْمٍ مِسْكِينًا، وَلاَ قَضَاءَ عَلَيْهِمَا.
قَالَ مَعْمَرٌ: وَأَخْبَرَنِي مَنْ سَمِعَ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ يَقُولُ: إِنْ لَمْ تَسْتَطِيعَا الصِّيَامَ فَلْتُطْعِمَا.

سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ دەڵێت : ئافرەتی دووگیان ڕۆژووەکەی دەشکێنێ ئەگەر هاتوو لە مانگی خۆیدا بوو(واتە لە نزیکی منداڵ بوون بوو یان لە کاتێك بوو منداڵەکەی پێویستی بە خواردن بوو)، وە ئافرەتی شیردەر ئەگەر ترسی هەبوو لەسەر منداڵەکەی ڕۆژووەکەی دەشکێنێ، وە خواردن دەدەن بۆ هەر ڕۆژێك بۆیان هەژارێك تێر دەکەن، وە قەزا کردنەوەیان لەسەر نیە .

مَعْمَرٌ دەڵێت : وە هەواڵیان پێداوم کە بیستویانە الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ دەیووت : ئەگەر نەیان توانی ڕۆژوو بگرن ڕۆژووەکەیان دەشکێنن .

٧٥٥٦- عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ قَتَادَةَ، قَالَ: تُفْطِرُ الْحَامِلُ الَّتِي تَخَافُ عَلَى وَلَدِهَا، وَتُفْطِرُ الْمُرْضِعُ الَّتِي تَخَافُ عَلَى وَلَدِهَا، وَتُطْعِمُ كُلُّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا كُلَّ يَوْمٍ مِسْكِينًا، وَلاَ قَضَاءَ عَلَيْهِمَا.

قَتَادَةَ دەڵێت : ئافرەتی دووگیان ئەگەر ترسی لەسەر منداڵەکەی هەبوو ڕۆژووەکەی دەشکێنێ وە ئافرەتی شیردەریش ئەگەر ترسی لەسەر منداڵەکەی هەبوو ڕۆژووەکەی دەشکێنێ، وە خواردن دەدەن بۆ هەر ڕۆژێك بۆیان هەژارێك تێر دەکەن، وە قەزا کردنەوەیان لەسەر نیە .

٧٥٥٧- عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنْ عَطَاءٍ، قَالَ: تُفْطِرُ الْحَامِلُ، وَالْمُرْضِعُ فِي رَمَضَانَ إِذَا خَافَتَا عَلَى أَوْلاَدِهِمَا فِي الصَّيْفِ قَالَ: وَفِي الشِّتَاءِ إِذَا خَافَتَا عَلَى أَوْلاَدِهِمَا.

عَطَاءٍ دەڵێت : ئافرەتی دووگیان و شیردەر ڕۆژووەکەیان دەشکێنن لە ڕەمەزاندا ئەگەر هاتوو ترسیان هەبوو لەسەر منداڵەکانیان لە هاویندا، دەڵێت : وە لە زستانیشدا ئەگەر ترسیان هەبوو لەسەر منداڵەکانیان .

٧٥٥٨- عَنْ مَعْمَرٍ، وَابْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَجْلاَنَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ لُبَيْبَةَ قَالَ: أَرْسَلَنِي عَبْدُ اللهِ بْنُ عَمْرٍو ابْنُ عُثْمَانَ إِلَى ابْنِ عُمَرَ أَسْأَلُهُ عَنِ امْرَأَةٍ أَتَى عَلَيْهَا رَمَضَانُ وَهِيَ حَامِلٌ قَالَ: تُفْطِرُ وَتُطْعِمُ كُلَّ يَوْمٍ مِسْكِينًا.

مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ لُبَيْبَةَ دەڵێت : عَبْدُ اللهِ بْنُ عَمْرٍو ابْنُ عُثْمَانَ ناردمی بۆ لای ابْنِ عُمَر ـ رَضِـيَ اللهُ عَنْهُما ـ پرسیارم لێی کرد دەربارەی ئافرەتێك دەگات بە ڕەمەزان و دووگیانە، فەرمووی : ڕۆژووەکەی دەشکێنێ و بۆ هەر ڕۆژێك خواردنی هەژارێك دەدات .

٧٥٦١- عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: الْحَامِلُ إِذَا خَشِيَتَ عَلَى نَفْسِهَا فِي رَمَضَانَ تُفْطِرُ، وَتُطْعِمُ، وَلاَ قَضَاءَ عَلَيْهَا.

<u>ابْنِ عُمَر ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما ـ دەڵێت :</u> ئافرەتی دووگیان ئەگەر ترسی لەسەر نەفسی خۆی هەبوو لە ڕەمەزاندا ڕۆژووەکەی دەشکێنێ، وە خواردن دەدات لەبری ، وە قەزاکردنەوەی لەسەر نیە .

٧٥٦٢- عَنِ الثَّوْرِيِّ، عَنْ حَمَّادٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: تُفْطِرُ وَتُطْعِمُ نِصْفَ صَاعٍ.

<u>إِبْرَاهِيم دەڵێت :</u> ڕۆژوو دەشکێنن و نیو صاع خواردن دەدەن بۆ هەر ڕۆژێك .

٧٥٦٣- عَنْ مَنْ سَمِعَ عِكْرِمَةَ يَقُولُ: يُفْطِرُ الْحَامِلُ وَالْمُرْضِعُ فِي رَمَضَانَ، وَتَقْضِيَانِ صِيَامًا، وَلاَ طَعَامَ عَلَيْهِمَا.

<u>عِكْرِمَة دەڵێت :</u> ئافرەتی دووگیان و شیردەر ڕۆژوو دەشکێنن لە ڕەمەزاندا، وە ڕۆژووەکەیان قەزا دەکەنەوە، وە خواردن دانیان لەسەر نیە .

٧٥٦٤- عَنِ الثَّوْرِيِّ، وَ- عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: تُفْطِرُ الْحَامِلُ وَالْمُرْضِعُ فِي رَمَضَانَ، وَتَقْضِيَانِ صِيَامًا، وَلاَ تُطْعِمَانِ.

<u>ابْنِ عَبَّاسٍ ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما ـ دەفەرموێت :</u> ئافرەتی دووگیان و شیردەر ڕۆژوو دەشکێنن لە ڕەمەزاندا، وە ڕۆژووەکەیان قەزا دەکەنەوە، وە خواردن نادەن .

٧٥٦٦- عَنْ فُضَيْلٍ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى عَلْقَمَةَ فَقَالَتْ: إِنِّي حُبْلَى، وَإِنِّي أُطِيقُ الصِّيَامَ، وَإِنَّ زَوْجِي يَمْنَعُنِي، فَقَالَ لَهَا عَلْقَمَةُ: أَطِيعِي رَبَّكَ، وَاعْصِي زَوْجَكِ.

إِبْرَاهِيم دەڵێت : ئافرەتێك هاتە لای عَلْقَمَة پێی وت: من دووگیانم، وە من ئەتوانم بە ڕۆژوو بم، وە هاوسەرەکەم ڕێگریم لێ دەکات،
عَلْقَمَة پێی ووت : گوێڕایەڵی پەروەردگارت بکەو بەقسەی هاوسەرەکەت مەکە .

٧٥٦٧- عَنِ ابْنِ التَّيْمِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ؛ أَنَّهُ كَانَ يَأْمُرُ وَلِيدَةً لَهُ حُبْلَى أَنْ تُفْطِرَ لَهُ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ.

وَقَالَ: أَنْتِ بِمَنْزِلَةِ الْكَبِيرِ لاَ يُطِيقُ الصِّيَامَ، فَأَفْطِرِي، وَأَطْعِمِي عَنْ كُلِّ يَوْمٍ نِصْفَ صَاعٍ مِنْ حِنْطَةٍ.

سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ دەگێڕێتەوە لە ابْنِ عَبَّاسٍ ـ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما ـ کە فەرمانی کردووە بە کەنیزەکەکەی کە دووگیان بوو کە ڕۆژووەکەی بشکێنێت لە مانگی ڕەمەزاندا .

وە فەرمووی : تۆ بە هاوشێوەی کەسانی بەتەمەنی ناتوانن ڕۆژوو بگرن، ڕۆژووەکەیان دەشکێنن، وە خواردن دەدەن بۆ هەر ڕۆژێك نیو صاع لە گەنم .

[مصنف عبدالرزاق]

حَدَّثَنَا أَبُو صَالِحٍ , ثنا أَبُو مَسْعُودٍ , ثنا أَبُو عَامِرٍ الْعَقَدِيُّ , ثنا هِشَامٌ , عَنْ قَتَادَةَ , عَنْ عَزْرَةَ , عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ , عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ " أَنَّهُ كَانَتْ لَهُ أَمَةٌ تُرْضِعُ فَأُجْهِضَتْ , فَأَمَرَهَا ابْنُ عَبَّاسٍ أَنْ تُفْطِرَ يَعْنِي: وَتُطْعِمَ وَلَا تَقْضِيَ ".

سَعِيدِ بْنُ جُبَيْرٍ دەگێڕێتەوە لە ابْنَ عَبَّاسٍ ـ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما ـ کە کەنیزەکێکی هەبوو منداڵی هەبوو شیری دەدا زۆر ناڕەحەت بوو،
ابْنَ عَبَّاسٍ فەرمانی پێکرد کە ڕۆژووەکەی بشکێنێ واتە فیدیەی بدات بەخۆراك وەنەشی گرێتەوە .

[سنن الدارقطني (٢٣٨٤)]

حَدَّثَنَا أَبُو صَالِحٍ الْأَصْبَهَانِيُّ , ثنا أَبُو مَسْعُودٍ , ثنا الْحَجَّاجُ , ثنا حَمَّادٌ , عَنْ أَيُّوبَ , عَنْ نَافِعٍ , عَنِ ابْنِ عُمَرَ , أَنَّ امْرَأَتَهُ , سَأَلَتْهُ وَهِيَ حُبْلَى , فَقَالَ: «أَفْطِرِي وَأَطْعِمِي عَنْ كُلِّ يَوْمٍ مِسْكِينًا وَلَا تَقْضِي»

نافع دەگێڕێتەوە لە ابْنِ عُمَر ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما ـ کە خێزانەکەی دووگیان بووەو پرسیاری لێکردووە دەربارەی ڕۆژووی ئافرەتی دووگیان، ئەویش لەوەڵامدا فەرموویەتی : ڕۆژووەکەت بشکێنەو ڕۆژوو مەگرە، فیدیەی بدە بۆ هەر ڕۆژێك خواردنی هەژارێك بدەو قەزای مەکەرەوە .

[سنن الدارقطني ( ٢٣٨٨)]

ثنا أَبُو صَالِحٍ , ثنا أَبُو مَسْعُودٍ , ثنا أَبُو أُسَامَةَ , عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ , عَنْ نَافِعٍ , قَالَ: كَانَتْ بِنْتٌ لِابْنِ عُمَرَ تَحْتَ رَجُلٍ مِنْ قُرَيْشٍ وَكَانَتْ حَامِلًا فَأَصَابَهَا عَطَشٌ فِي رَمَضَانَ , فَأَمَرَهَا ابْنُ عُمَرَ «أَنْ تُفْطِرَ وَتُطْعِمَ عَنْ كُلِّ يَوْمٍ مِسْكِينًا»

نَافِعٍ دەڵێت : ابْنِ عُمَر ـ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما ـ کچێکی شووی کردبوو بەپیاوێك لەقوڕەیش دووگیان بوو، ڕۆژێك لەڕەمەزان دا تووشی تینوێتییەکی زۆربوو، ابْنِ عُمَر فەرمانی پێکرد ڕۆژووەکەی بشکێنێ و نەیگرێ لەجیاتیدا بۆ هەر ڕۆژێك خواردنی هەژارێك بدات .

[سنن الدارقطني (٢٣٨٩)]

// تێبینی : ئافرەتی دووگیان و شیردەر گەر ترسیان هەبوو لەسەر نەفسی خۆیان یان منداڵەکەیان ئەوا ڕۆژوو ناگرن و دواتر گەر ویستیان دەتوانن قەزای بکەنەوە، گەر نەیان ویست قەزای بکەنەوە دەتوانن بۆ هەر ڕۆژێك نیو صاع خواردن بدەن بە هەژاران لە خواردنی قووتی خەڵکەکە لەسەردەمی هاوەڵان زیاتر (گەنم) بووە بۆیە ابن عباس دەڵێت گەنم بدەن، لە ئێستاشدا زیاتر برنجە بۆیە ئەتوانن برنج بدەن گەر خواردنی تریشی لەگەڵ دابنێین زیادە شتێکی باشە، والله اعلم .

# دەروازەیی بــیست و شــەشــ

## | ئایا دروستە بەبێ دەست نوێژ قورئان بخوێنرێت؟ یان دروستە دەست لە قورئان بدرێت بەبێ دەست نوێژ ؟ |

وەڵام : بەڵێ دروستە بەبێ دەست نوێژ قورئان بخوێنرێت، بەڵام دروست نیە دەست لە قورئان بدرێت بەبێ دەست نوێژ .

پێغەمبەری الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ شەوی وا بووە هەستاوە بۆ شەو نوێژ لەگەڵ هەستانیدا پێش ئەوەی دەست نوێژ بگرێت قورئانی خوێندووە وەك چۆن ابن عباس بۆمان دەگێڕێتەوە :

لە کورەیبی مەولای ابن عباس ـەوە ـ رَضِـيَ اللهُ عَنْهُما ـ کە ابن عباس بۆی گێراوەتەوە دەڵێت : ابن عباس شەوێکیان لای مەیمونە دایکی ئیمانداران مایەوە ـ رَضِـيَ اللهُ عَنْها ـ کە پوری بووە

ووتی : پاڵکەوتم لەسەر لایەکی ڕاخەرەکە و خەوتم وە پێغەمبەری الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ و خێزانەکەی پاڵکەوتن لەسەر لای درێژایی ڕاخەرەکە و پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ خەوت هەتاکو نیوەی شەو یان کەمێك پێش نیوەی شەو یان کەمێك دوای نیوەی شەو پاشان پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ هەستا دەستی هێنا بە دەموو چاویدا تاکو خەوەکەی بڕوات پاشان دە ئایەتی کۆتایی سورەتی آل عمران ـی خوێند پاشان هەستا

چووە لای جەوەنەیەکی هەڵواسراو کە ئاوی تێدا بوو، دەست نوێژی لێگرت بە چاکترین شێوە پاشان هەستا و نوێژی کرد

ابن عباس الله لێی ڕازی بێت ووتی : جا منیش هەستام ئەوەی پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ كردی منیش هەمان شتم كرد پاشان ڕۆشتمە لایەوە پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ دەستی ڕاستی دانا لەسەر سەرم و گوێی ڕاستی گرتم و بایدا (واتە هێنایە پەنایە خۆیەوە)

پاشان دوو ڕكات نوێژی کرد پاشان دوو ڕکاتی تری کرد پاشان دوو ڕکاتی کرد پاشان دوو ڕکاتی تری کرد پاشان دوو ڕکاتی تری کرد پاشان دوو ڕکاتی تری کرد پاشان نوێژی ویتری کرد پاشان پاڵکەوت هەتا بانگی دا پاشان هەستا دوو ڕکاتی کرد بە سوکی و دواتر چووە دەرەوە بۆ مزگەوت و نوێژی بەیانی کرد .

حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ ، عَنْ مَخْرَمَةَ بْنِ سُلَيْمَانَ ، عَنْ كُرَيْبٍ - مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ - أَنَّهُ أَخْبَرَهُ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّهُ بَاتَ عِنْدَ مَيْمُونَةَ - أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا وَهِيَ خَالَتُهُ - قَالَ : فَاضْطَجَعْتُ عَلَى عَرْضِ الْوِسَادَةِ، وَاضْطَجَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَهْلُهُ فِي طُولِهَا، فَنَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى انْتَصَفَ اللَّيْلُ أَوْ قَبْلَهُ بِقَلِيلٍ أَوْ بَعْدَهُ بِقَلِيلٍ، ثُمَّ اسْتَيْقَظَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَجَلَسَ، فَمَسَحَ النَّوْمَ عَنْ وَجْهِهِ بِيَدِهِ، ثُمَّ قَرَأَ الْعَشْرَ آيَاتٍ خَوَاتِيمَ سُورَةِ آلِ عِمْرَانَ، ثُمَّ قَامَ إِلَى شَنٍّ مُعَلَّقَةٍ فَتَوَضَّأَ مِنْهَا فَأَحْسَنَ وُضُوءَهُ ثُمَّ قَامَ يُصَلِّي، قَالَ : عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، فَقُمْتُ فَصَنَعْتُ مِثْلَ مَا صَنَعَ، ثُمَّ ذَهَبْتُ فَقُمْتُ إِلَى جَنْبِهِ، فَوَضَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى رَأْسِي، وَأَخَذَ بِأُذُنِي الْيُمْنَى يَفْتِلُهَا بِيَدِهِ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ أَوْتَرَ، ثُمَّ اضْطَجَعَ حَتَّى جَاءَهُ الْمُؤَذِّنُ، فَقَامَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ، ثُمَّ خَرَجَ فَصَلَّى الصُّبْحَ.

[صحيح البخاري (١١٩٨)، ومسلم (٧٦٣)]

* قورئان خوێندن لای ئەهلی عیلم کێشەی نەبووە بەبێ دەستنوێژ بە مەرجێك دەست لە قورئانەکە نەدەیت :

ابن أبي شيبة لە مصنف بابێکی داناوە لەسەر ئەم بابەتە بەناوی :

[(١٢٣) في الرجل يقرا القرآن وهو غير طاهر]

واتە: لە بارەی پیاوێك قورئان دەخوێنێت و لە کاتی پاکیدا نیە(واتە دەست نوێژی نیە).

عبدالرحمن بن یزید دەڵێت : ئێمە لەگەڵ سەلمان فارسی ـ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ـ بووین بۆ پێویستی و کارێك، پاشان ڕۆشت دەستی بە ئاو گەیاند و هاتەوە، پێمان ووت : دەست نوێژ بگرە، ئەی باوکی عبداللّٰه لەوانەیە کە پرسیارت لێ بکەین دەربارەی شتێك لە قورئان؟

ووتی : بپرسن، چونکە من دەست لە قورئان نادەم، کەس دەست لە قورئان نادات ئیلا پاك نەبێت (ئەوانەی دەست نوێژیان هەیە)، ووتی : پرسیارمان لێ کرد، قورئانی بۆ خوێندینەوە پێش ئەوەی کە دەست نوێژ بگرێت.

١١٠٦- حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ، قَالَ: كُنَّا مَعَ سَلْمَانَ فِي حَاجَةٍ، فَذَهَبَ فَقَضَي حَاجَتَهُ ثُمَّ رَجَعَ، فَقُلْنَا لَهُ: تَوَضَّأْ، يَا أَبَا عَبْدِ اللهِ لَعَلَّنَا أَنْ نَسْأَلَك عَنْ آيٍ مِنَ الْقُرْآنِ؟ قَالَ: قَالَ: فَاسْأَلُوا، فَإِنِّي لاَ أَمَسُّهُ، إِنَّهُ لاَ يَمَسُّهُ إِلاَّ الْمُطَهَّرُونَ، قَالَ: فَسَأَلْنَاهُ، فَقَرَأَ عَلَيْنَا قَبْلَ أَنْ يَتَوَضَّأَ.

عەلقەمە و ئەسوەد دەگێڕنەوە كە سەلمان قورئانی بۆ خوێندوون دوای چوونە سەر ئاو و بێ دەست نوێژی . (واتە بە حیفظ دەیخوێند نەك دەستت لە مصحەف بدات)

١١٠٧- حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ يَزِيدِ بْنِ مُعَاوِيَةَ، عَنْ عَلْقَمَةَ وَالأَسْوَدِ؛ أَنَّ سَلْمَانَ قَرَأَ عَلَيْهِمَا بَعْدَ الْحَدَثِ.

سعيد بن جبير دەڵێت : ابْنِ عَبَّاسٍ، وە ابْنِ عُمَرَ - رَضِيَ اللهُ عَنْهُما - بەشێك لە قورئانیان دەخوێند دوای ئەوەی دەردەچوون لە سەر ئاو، پێش ئەوەی دەست نوێژ بگرن . (واتە بە حیفظ دەیخوێند نەك دەستت لە مصحەف بدات).

١١٠٨- حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ سَلَمَةَ بْنِ كُهَيْلٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَابْنِ عُمَرَ، قَالَ: كَانَا يَقْرَآنِ أَجْزَاءَهُمَا مِنَ الْقُرْآنِ بَعْدَ مَا يَخْرُجَانِ مِنَ الْخَلاَءِ، قَبْلَ أَنْ يَتَوَضَّأَ.

سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ دەگێڕێتەوە كە أبو هريرة - رَضِيَ اللهُ عَنْهُ - لە شوێنی دەست بە ئاو گەیاندن دەهاتە دەرەوە و پاشان سورەتێكی بە خێرایی دەخوێند . (واتە بە حیفظ دەیخوێند نەك دەستت لە مصحەف بدات)

١١٠٩ـ حَدَّثَنَا ابْنُ نُمَيْرٍ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ؛ أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ كَانَ يَخْرُجُ مِنَ الْمَخْرَجِ، ثُمَّ يَحْدُرُ السُّورَةَ.

محمد دەگێڕێتەوە کە عومەری کوڕی خطاب ـ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ـ دەستی بە ئاو گەیاند، پاشان دەستی کرد بە قورئان خوێندن، . (واتە بە حیفظ دەیخوێند نەك دەستت لە مصحەف بدات)

أبو مەریەم پێی ووت : ئەگەر دەست نوێژت بگرتایە ئەی ئەمیری ئیمانداران(واتە دەست نوێژت بگرتایە باشتر بوو)،
ئیمام عمر پێی فەرموو : ئایا موسەیلەمە ئەم فتوایەی بۆ داوی ؟!.

١١١٠ـ حَدَّثَنَا الثَّقَفِيُّ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ مُحَمَّدٍ؛ أَنَّ عُمَرَ قَضَى حَاجَتَهُ، ثُمَّ أَخَذَ يَقْرَأُ، فَقَالَ لَهُ أَبُو مَرْيَمَ: لَوْ تَوَضَّأْتَ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: أَمُسَيْلِمَةُ أَفْتَاكَ ذَاكَ؟!.

قتادة دەڵێت : عومەری کوڕی خطاب ـ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ـ دەرچوو لە سەرئاو ئایەتێکی خوێندەوە لە کتابی الله،
پێی ووترا : قورئان دەخوێنیت و دەست نوێژیشت نیە؟
فەرمووی: ئایا ئەوە موسەیلەمە بۆی خوێندنەوە؟

١١١٢ـ حَدَّثَنَا عَبْدَةُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ قَتَادَةَ، قَالَ:
خَرَجَ عُمَرُ مِنَ الْخَلاَءِ فَقَرَأَ آيَةً مِنْ كِتَابِ اللهِ، فَقِيلَ لَهُ:
أَتَقْرَأُ وَقَدْ أَحْدَثْتَ؟ قَالَ: أَفَيَقْرَأُ ذَلِكَ مُسَيْلِمَةُ؟

أبي بشر دەگێڕێتەوە لە نَافِعِ بْنِ جُبَيْرٍ کە وای نەبینیوە قورئان خوێندن لەسەر غیری پاکی(بەبێ دەست نوێژ) کێشەی هەبێت .

١١١٤ـ حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، عَنْ أَبِي بِشْرٍ، عَنْ نَافِعِ بْنِ جُبَيْرٍ؛ أَنَّهُ لَمْ يَرَ بَأْسًا بِالْقُرْآنِ عَلَى غَيْرِ طَهَارَةٍ.

أبي جعفر دەڵێت : عَلِيُّ بْنُ حُسَيْنٍ قورئانی دەخوێند دوای چوونە سەرئاو و بەبێ دەست نوێژ . (واتە بە حیفظ دەیخوێند نەك دەستت لە مصحەف بدات)

١١١٥- حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ حُمَيْدٍ، عَنْ أَبِي جَعْفَرٍ، قَالَ: كَانَ عَلِيُّ بْنُ حُسَيْنٍ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ بَعْدَ الْحَدَثِ.

سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ دەڵێت : هەندێك جار كە لە سەفەرم لا ئەدەم بۆ ئەوەی دەست بە ئاو بگەیەنم بۆ پیسایی كردن یان میز كردن پاشان تا ئەگەمەوە بە هاوەڵەكانم قورئان دەخوێنم پێش ئەوەی دەست نوێژ بگرم .

١١١٧- حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الشَّيْبَانِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، قَالَ:
رُبَّمَا نَزَلْتُ وَأَنَا فِي السَّفَرِ لأَقْضِيَ حَاجَتِي مِنَ الْغَائِطِ وَالْبَوْلِ، فَمَا أَلْحَقُ بِأَصْحَابِي حَتَّى أَقْرَأَ جُزْءًا مِنَ الْقُرْآنِ، قَبْلَ أَنْ أَتَوَضَّأَ.

أبي مِجْلَزٍ دەڵێت : من قورئانم دەخوێند لەسەر موصحفی قورئانەكە، باوكم دەرچوو لە سەرئاو، لەو كاتەدا ئایەتێك لەبەر چاو نەما، باوكم بیری خستمەوە .

١١١٨- حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُدَيْرٍ، عَنْ أَبِي مِجْلَزٍ ، قَالَ:
كُنْتُ أَقْرَأُ فِي الْمُصْحَفِ، فَخَرَجَ أَبِي مِنَ الْخَلاَءِ، وَقَدْ تَعَايَيْتُ فِي آيَةٍ، فَأَذْكَرَنِيهَا.

علي كوڕی ئەبی طالب - رَضِيَ اللهُ عَنْهُ - دەفەرموێت : قورئان بخوێنە لە هەموو حاڵەتێك مادەم تووشی لەشگرانی نەبوویت .
( واتە لە جەنابەت و لەشگرانی مەیخوێنە ) .

١١١٩- حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الْحَارِثِ، عَنْ عَلِيٍّ، قَالَ: اقْرَأَ الْقُرْآنَ عَلَى كُلِّ حَالٍ مَا لَمْ تَكُنْ جُنُبًا.

رَبیعٍ دەگێڕێتەوە لە ابْنِ سِیرِینَ کە قورئانی دەخوێند دوای سەرئاو و بەبێ دەستت نوێژ .

١١٢٠- حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ رَبِيعٍ، عَنِ ابْنِ سِيرِينَ؛ أَنَّهُ كَانَ يَقْرَأُ بَعْدَ الْحَدَثِ.

إبراهيم النخعي دەڵێت : دەیان ووت(هاوەڵان) : قورئان بخوێنە لە هەموو حاڵەتێك مادەم تووشی لەشگرانی نەبوویت .
( واتە لە جەنابەت و لەشگرانی مەیخوێنە ) .

١١٢١- حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: كَانَ يُقَالُ: اقْرَأَ الْقُرْآنَ عَلَى كُلِّ حَالٍ مَا لَمْ تَكُنْ جُنُبًا.

إبراهيم دەگێڕێتەوە لە عبدالله بن مسعود - رَضِيَ اللهُ عَنْهُ - کە پیاوێکی لەگەڵ بووە میزی کرد پاشان هاتەوە،
ابن مسعود پێی ووت : قورئان بخوێنێ .

١١٢٢- حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ حَمَّادٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ؛ أَنَّهُ كَانَ مَعَهُ رَجُلٌ فَبَالَ ثُمَّ جَاءَ، فَقَالَ لَهُ ابْنُ مَسْعُودٍ: اِقْرِئْه.

[مصنف ابن أبي شيبة]

// بە ئیجماع خوێندنی قورئان بەبێ دەست نوێژ دروستە ئەگەر دەست لە قورئان نەدەیت و لە جەنابەت نەبیت :

ابن عبدِ البَرِّ دەڵێت : پێنازانم جیاوازی هەبێت لە دروستێتی خوێندنی قورئان لەسەر بێ دەست نوێژی، مادەم تووشی لەشگرانی نەبوویت(واتە لە جەنابەت دروست نیە).

قال ابن عبدِ البَرِّ: (ما أعلم خلافًا في جواز قراءة القرآن على غير وضوء، ما لم يكُن حدَثُه جنابةً).

[الاستذكار ( ٢/١٠٤)]

// دروست نیه دەست لە قورئان بدرێت بەبێ دەست نوێژ بە کۆدەنگی زانایان :

ابنُ عبدِ البَرّ دەڵێت : فوقەهای هەمووی ناوچەکان ئەوانەی فتوا بەدەوریان دەسورِێتەوە و ئەهلی ئەوەن، بەوەی کە مصحف(قورئان) دەستی لێ نادات تەنها پاك نەبێت، وە ئەوە ووتەی (ماليك و شافعی و وە سفيان الثوري و ئەوزاعی و أحمد بن حنبل و إسحاق بن راهويه و أبي ثور ، أبي عُبيد ـه)، وە ئەئمەکانی ڕەئی و حديث لە ناوچەکانيان، وە ئەمە ڕيوايەت کراوە لە (سعد بن أبي وقاص و عبدالله بن عمر وە طاوس و الحسن و الشعبي و القاسم بن محمد وعطاء) و لە ئەئمەکانی تابعين لە مەدينە و مەککە و يەمەن و کوفەو بەصرە .

قال ابنُ عبدِ البَرّ: (أجمع فقهاءُ الأمصارِ الذين تدور عليهم الفتوى وعلى أصحابهم، بأنَّ المصحَفَ لا يَمسُّه إلَّا الطَّاهِرُ، وهو قول مالك، والشافعيِّ، وأبي حنيفة، وأصحابهم، والثوريِّ، والأوزاعيِّ، وأحمدَ بن حنبل، وإسحاق بن راهويه، وأبي ثور، وأبي عُبيد، وهؤلاء أئمَّة الرأي والحديث في أعصارهم، ورُوي ذلك عن سعد بن أبي وقَّاص، وعبد الله بن عمر، وطاوس، والحسن، والشعبيِّ، والقاسم بن محمَّد، وعطاء، وهؤلاء من أئمَّة التابعين بالمدينة ومكَّة واليمن والكوفة والبَصرة).

[الاستذكار ( ٢/٤٧٢ )]

ابن قدامة دەڵێت : دەست لە مصحف(قورئان) نادات تەنها پاك نەبێت، واتە: پاك بێت لە هەردوو بێ نوێژیەکە هەمووی(بێ دەست نوێژ و جەنابەت)، ئەمە ڕيوايەت کراوا لە (ابن عمر و الحسن وعطاء و طاوس والشعبي

والقاسم بن محمد)، وە ئەوە ووتەی (ماليك و شافعی ) وە نازانين كەس پێچەوانەی ئەمەی كردبێ تەنها (داود) نەبێت، لەبەر ئەوەی ئەو بە جائيزی زانيوە .

قال ابن قدامة: (لا يمسَّ المصحف إلَّا طاهرٌ؛ يعني: طاهرًا من الحدثين جميعًا؛ رُوي هذا عن ابن عمر والحسَن وعطاء وطاوس والشَّعبي والقاسم بن محمَّد، وهو قول مالك والشافعيِّ وأصحاب الرأي، ولا نعلم مخالفًا لهم إلَّا داود؛ فإنَّه أباح مسَّه).

[المغني (١٠٨/١)]

# دەروازەیی بـــیست و حـــــەوت

## | قورئان خوێندنی ئافرەتی حائض ـە و ئینسانی لەش گران |

قەولی دروست و ڕاجح ئەوەیە ئافرەتی حائض ـە و ئینسانی لەش گران بۆیان نییە قورئان بخوێنن، ئیللا مەگەر سەری ئایەتێك یاخود ئەویەرەکەی ئایەتێك ئەمە قەولی جمهوری صەحابە و تابعین و دوای ئەوانیشە، قەولی هەریەك لە (عمر کوڕی خطاب و علي کوڕی أبی طالب و عبدالله کوڕی مسعود و الأسود کوڕی یزید النخعي و سعید کوڕی جبیر و عطاء کوڕی أبي رباح و مجاهد و عکرمة و عامر الشعبي و أبي وائل و أبي العالیة و محمد کوڕی سیرین و إبراهیم النخعي و سفیان الثوري و عبدالله کوڕی مبارك و شافعي و أحمد کوڕی حنبل و إسحاق بن راهویة و غیری ئەوانیشە).

ڕەسول الله ـ صلی الله علیه وسلم ـ فەرموویەتی : ئافرەتی حائض ـە لەگەڵ ئینسانی لەش گران بۆیان نییە قورئان بخوێنن.

حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ وَالْحَسَنُ بْنُ عَرَفَةَ ، قَالَا : حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَيَّاشٍ ، عَنْ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ ، عَنْ نَافِعٍ ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهُ ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ : { لَا تَقْرَأُ الْحَائِضُ وَلَا الْجُنُبُ شَيْئًا مِنَ الْقُرْآنِ }.
وَفِي الْبَابِ عَنْ عَلِيٍّ. حَدِيثُ ابْنِ عُمَرَ حَدِيثٌ لَا نَعْرِفُهُ إِلَّا مِنْ حَدِيثِ إِسْمَاعِيلَ بْنِ عَيَّاشٍ ، عَنْ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ ، عَنْ نَافِعٍ ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ : « لَا يَقْرَأُ الْجُنُبُ وَلَا الْحَائِضُ ». وَهُوَ قَوْلُ أَكْثَرِ أَهْلِ الْعِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ وَالتَّابِعِينَ وَمَنْ بَعْدَهُمْ ، مِثْلِ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ ، وَابْنِ الْمُبَارَكِ ، وَالشَّافِعِيِّ ، وَأَحْمَدَ ، وَإِسْحَاقَ ، قَالُوا : لَا تَقْرَأُ الْحَائِضُ وَلَا الْجُنُبُ مِنَ الْقُرْآنِ شَيْئًا إِلَّا طَرَفَ الْآيَةِ وَالْحَرْفَ وَنَحْوَ ذَلِكَ. وَرَخَّصُوا لِلْجُنُبِ وَالْحَائِضِ فِي التَّسْبِيحِ وَالتَّهْلِيلِ. وَسَمِعْتُ مُحَمَّدَ بْنَ إِسْمَاعِيلَ يَقُولُ : إِنَّ إِسْمَاعِيلَ بْنَ عَيَّاشٍ يَرْوِي عَنْ أَهْلِ الْحِجَازِ وَأَهْلِ الْعِرَاقِ أَحَادِيثَ

مَنَاكِيرَ ، كَأَنَّهُ ضَعَّفَ رِوَايَتَهُ عَنْهُمْ فِيمَا يَتَفَرَّدُ بِهِ. وَقَالَ : إِنَّمَا حَدِيثُ إِسْمَاعِيلَ بْنِ عَيَّاشٍ ، عَنْ أَهْلِ الشَّامِ.

[ سنن الترمذي ( ١٣١ )]

ئەم حديثه هەرچەنده تضعيف كراوه ، چونكه إسماعيل كوڕی عياش له سەنەدەكەيدايه ڕيوايەتی ئەو له ئەهلی شام صحيحه، بەڵام ڕيوايەتی له ئەهلی عێراق و حجاز ضعيفه، موسى كوڕی عقبه كه إسماعيل لێوەی ڕيوايەت دەكات خەڵكی مەدينه يه واته حجازی يه.
بەڵام ئەهلی عيلم لەسەر ئەوەن كه ئافرەت له كاتی حيض دا لەگەڵ ئينسانی لەش گران بۆيان نييه قورئان بخوێنن. ئەمه عەمەلی جمهوری ئەهلی عيلمی لەسەره هەر له صەحابەوه هەتا تابعين و دوای ئەوانيش، وەك ( سفيان الثوري و عبدالله كوڕی مبارك و شافعي و أحمد و إسحاق كوڕی راهوية و غيری ئەوانيش) وتوويانه : ئافرەتی حائض ـه و ئينسانی لەش گران بۆيان نييه قورئان بخوێنن ئيللا مەگەر بەشێك و سەرەتای ئايەتێک ياخود حەرفێك لێی، بەڵام دەتوانن تەسبيحات و تەكبيرات بكەن هەروەك چۆن ئيمامی الترمذي دوای هێنانی حديثەكه ئەمەی وتووه.

كاتێك دەڵێ عەمەلی جمهوری لەسەره له صەحابه و تابعين و دوای ئەوانيش ئيتر خەڵكی ئەم سەردەمه كێن بڵێن بۆيان هەيه قورئان بخوێنن**!!** دەكرێ خيلافی جمهوری صەحابه و دوو قەڕنی دوای ئەوان بكرێ بۆ قەولی ئەشخاصی ئەم سەردەمه**!!**

هەتا أبو بكر إبن أبي شيبة له كتێبەكەيدا [المُصَنَف] بابێكی داناوه لەسەر ئەوەی ئينسانی لەش گران بۆی نييه قورئان بخوێنێ **(**١٢١- مَن كَرِهَ أَن يَقرَأ الجُنُبُ القُرآنَ**)** :

<u>عمر كوڕی خطاب ـ رضي الله عنه ـ دەفەرمووێت :</u> ئينسانی لەش گران بۆی نييه قورئان بخوێنێ.

١٠٨٨- حدثنا حفص وأبو مُعاوية ، عن الأعمش ، عن شقيق ، عن عبيدة ، عن عمر ، قال : لا يقرأُ الجُنُبُ القُرآنَ.

إبراهيم النخعي دەڵێت : عبدالله کوڕی مسعود - رضی الله عنه - بە لای ڕووباری فوڕات تێدەپەڕی و قورئانی دەخوێند بۆ پیاوێك، إبن مسعود میزی کرد، پیاوەکە وازی هێنا لەوەی گوێی بۆ بگرێ، إبن مسعود وتی : ئەوە چیتە؟
پیاوەکە وتی : تۆ میزت کرد. إبن مسعود وتی : من خۆ لەش گران نیم.

١٠٨٩- حدثنا غُندر ، عن شُعبَة ، عن حَماد ، عن إبراهيم ، أَنَّ ابن مسعود كان يمشي نحو الفرات وهو يقرئ رَجُلًا ، فَبَالَ ابن مسعود فكَفَّ الرُجل عنه ، فقال : ابن مسعود : ما لَكَ؟ قال : إِنَّك بُلتَ ، فقال ابن مسعودٍ : إنِّي لست بِجُنُبٍ.

// وتم ئەگەر دروست بووایە لەش گران قورئان بخوێنێ ئەوە إبن مسعود بەو پیاوەی نەدەوت خۆ من لەش گران نیم.

الأسود کوڕی يزيد النخعي دەڵێت : ئینسانی لەش گران بۆی نییە قورئان بخوێنێ.

١٠٩١- حدثنا ابن مهدي ، عن سفيان ، عن إبراهيم بن المهاجر ، عن إبراهيم ، عنِ الأسوَدِ ، قال : لا يَقرأُ الجُنُبُ.

مجاهد دەڵێت : ئینسانی لەش گران بۆی نییە قورئان بخوێنێ.

١٠٩٢- حدثنا ابن عيينة ، عن ابن أبي نجيحٍ ، عن مُجاهدٍ ، قال : لا يَقرأُ الجُنُبُ القُرآنَ.

عامر الشعبي دەڵێت : ئینسانی لەش گران و ئافرەتی حائض ـە بۆیان نییە قورئان بخوێنن.

١٠٩٣- حدثنا شَريكٌ ، عن فِراسٍ ، عن عامرٍ ، قال : الجُنُبُ والحائضُ لا يَقرآنِ القُرآنَ.

أبي وائل دەڵێت : ئینسانی لەش گران و ئافرەتی حائض ـە بۆیان نییە قورئان بخوێنن.

١٠٩٤- حدثنا غُندر ، عن شُعبَة ، عن سَيَّارٍ ، عن أبي وائلٍ ، قال : لا يَقرأُ الجُنُبُ والحائضُ القُرآنَ.

إبراهيم النخعي دەڵێت : ئینسانی لەش گران بۆی نییە قورئان بخوێنێ، ئەگەر بۆی هەبوایە قورئان بخوێنێ ئەوە دەیتوانی نوێژیش بکات.

١٠٩٦- حدثنا جَرير ، عن مُغَيرَةَ ، عن إبراهيمَ ، قال : لا يَقرأُ الجُنُبُ القُرآنَ ، وقال ، إِنَّه إذا قَرأَ صَلَّى.

وە إبن أبي شيبة دوای ئەو بابەی سەرەوە بابێکی تر دێنێ بە ناونیشانی **(١٢٢- مَن رَخَّصَ لِلجُنُبِ أَن يَقرَأَ مِنَ القُرآنِ)** کێ ڕوخصەی داوە لەش گران قورئان بخوێنێ، بەڵام ئەوانەشی ئیزنیان داوە بە موتڵەقی نییە، بەڵکو وتوویانە ئایەتێك یان دوو ئایەت یاخود سەری ئایەتەکە.

جعفر الصادق لە محمد الباقر ـی باوکیەوە دێنێ : کە ڕێی داوە و بە خراپی نەدیوە ئافرەتی حائض ـە لەگەڵ ئینسانی لەش گران شتێك لە قورئان بخوێنن.

١٠٩٧- حدثنا عبدالوهاب الثقفي ، عن جعفر ، عن أبيه ، أنه كان لا يرى بأسًا أن يَقرأَ الجُنُبُ والحائضُ الشيء مِن القُرآن.

// وتم ئەمەش وەك هەموو قەولەکانەی ترە کە ڕێیان داوە ئایەتێك یان سەری ئایەتەکە بخوێنێ.

لە خالد ـەوە ، عکرمة : بە خراپی نەدیوە کە ئینسانی لەش گران ئایەتێك یاخود دوو ئایەت بخوێنێ.

١٠٩٨- حدثنا الثقفي ، عن خالد ، عن عكرمة ، أَنَّه كان لا يرى بأسًا أن يَقرأَ الجُنُبُ الآية والآيتين.

حماد لە إبراهيم النخعي و سعيد کوڕی جبیر ـەوە دەیهێنێ وتوویانە : ئافرەتی حائض ـە لەگەڵ ئینسانی لەش گران سەری ئایەتەکە دەخوێننەوە ، بەڵام تەواوی ناکەن هەتا کۆتاییەکەی.

١٠٩٩- حدثنا أبو خالد الأحمر ، عن حجاجٍ ، عن عطاءٍ ، وعن حمادٍ ، عن إبراهيمَ ، وسعيد بن جُبيرٍ في الحائضِ ، والجُنُبِ يستفتحون رأس الآية ، ولا يُتِمُّونَ آخرها.

عمر کوڕی عبدالله دەڵێت : پرسیارم کرد لە سعید کوڕی جبیر ئایا ئافرەتی حائض ـە لەگەڵ ئینسانی لەش گران قورئان دەخوێنن؟
ووتی : ئایەتێك یاخود دوو ئایەت.

١١٠١- حدثنا عبيدالله ، عن إسرائيلَ ، عن عمر بن عبدالله ، قال : سألتُ سعيد بن جُبيرٍ تَقرَأُ الحائضُ والجُنُبُ ، قال : الآية والآيتين.

أبي العالية الرياحي دەڵێ : ئافرەتی حائض ـە بۆی نییە قورئان بخوێنێ.

١١٠٤- حدثنا حفصُ ، عن عاصمٍ ، عن أبي العاليةِ ، قال : الحائضُ لا تَقرَأُ القُرآنَ.

محمد كوڕی سیرین دەڵێت : ئافرەتی حائض ـە بۆی نییە قورئان بخوێنێ.

١١٠٥- حدثنا حفصُ ، عن أشعَثَ ، عن محمدٍ ، قال : لا تَقرَأُ القُرآنَ.

إبراهيم النخعي دەڵێت : كەمتر لە ئایەتێك دەخوێنێ، بۆی نییە هەموو ئایەتەكە تەواو بكات.

١١٠٦- حدثنا وَكيعُ ، عن سُفيانَ ، عن مُغَيرةَ ، عن إبراهيمَ ، قال : تَقرَأ مِما دون الآية ، ولا تَقرَأُ آيةً تامةً.

وەك بینیتان ئەوانەشی ڕێیان داوە بە موتڵەقی نییە، تەنها بۆ سەرەتای ئایەتەكە ڕێیان داوە یاخود ئایەتێك یان دوو ئایەت.

إبراهيم النخعي دەڵێت : چوار كەس بۆیان نییە قورئان بخوێنن كەسێك : لە تەوالێت بێ، وە لە حمام، وە لەش گران و ئافرەتی حائض ـەش، بەڵام بۆ لەش گران و حائض ـە ئەوە تەنها بۆیان هەیە ئایەتێك بخوێنن.

أَخْبَرَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ ، عَنْ هِشَامٍ الدَّسْتُوَائِيِّ ، عَنْ حَمَّادٍ ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ قَالَ : أَرْبَعَةٌ لَا يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ : عِنْدَ الْخَلَاءِ ، وَفِي الْحَمَّامِ ، وَالْجُنُبُ ، وَالْحَائِضُ ، إِلَّا الْآيَةَ وَنَحْوَهَا لِلْجُنُبِ وَالْحَائِضِ.

[ سنن الدارمي (١٠١٦)]

أبي وائل دەڵێت : وتراوە : ئینسانی لەش گران و ئافرەتی حائض ـە بۆیان نییە قورئان بخوێنن، وە نابێ لە حمام قورئان بخوێنرێ، وە دوو حاڵیش هەن عەبد بۆی نییە زیكری الله ـیان تێدا بكات : لە تەوالێت و كاتی سەرجێیی، بەڵام پیاو بۆی هەیە كاتێك بچێتە لای خێزانی بسم الله بكات.

أَخْبَرَنَا سَهْلُ بْنُ حَمَّادٍ ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ ، عَنْ سَيَّارٍ ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ قَالَ : كَانَ يُقَالُ : لَا يَقْرَأُ الْجُنُبُ وَلَا الْحَائِضُ ، وَلَا يُقْرَأُ فِي الْحَمَّامِ ، وَحَالَانِ لَا يَذْكُرُ الْعَبْدُ فِيهِمَا اللَّهَ : عِنْدَ الْخَلَاءِ وَعِنْدَ الْجِمَاعِ ، إِلَّا أَنَّ الرَّجُلَ إِذَا أَتَى أَهْلَهُ بَدَأَ فَسَمَّى اللَّهَ.

[ سنن الدارمي (١٠٢١)]

أبي العالية الرياحي دەڵێت : ئافرەتی حائض ـە بۆی نییە قورئان بخوێنێ.

أَخْبَرَنَا حَجَّاجٌ ، عَنْ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ ، عَنْ عَاصِمٍ الْأَحْوَلِ ، عَنْ أَبِي الْعَالِيَةِ فِي الْحَائِضِ ، قَالَ : لَا تَقْرَأُ الْقُرْآنَ.

[سنن الدارمي ( ١٠١٨)]

إبن أبي مليكة دەڵێت : عائشة ـ رضي الله عنها ـ ڕوقیەی دەخوێند بەسەر أسماء ـ رضي الله عنها ـ کاتێك کە لە حیض ـدا بووایە.

أَخْبَرَنَا عُبَيْدُاللَّه بْنُ مُوسَى وَأَبُو نُعَيْمٍ ، قَالَا : أَنْبَأَنَا السَّائِبُ بْنُ عُمَرَ ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ ، أَنَّ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا كَانَتْ تَرْقِي أَسْمَاءَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا وَهِيَ عَارِكٌ.

[ سنن الدارمي ( ١٠١٩)]

// وتم ئەگەر جائز بوایە حائض ـە قورئان بخوێنێ ئەوە أسماء خۆی ڕوقیەی دەخوێند بەسەر خۆیدا، کاتێك جائز نەبووە ئەوە دایکمان عائشة بۆی کردووە.

عبدالملك دەڵێت : پرسیار کرا لە عطاء ئایا ئافرەت لە کاتی حیض ـدا قورئان دەخوێنێ؟
ووتی : نەخێر، ئیللا مەگەر بەشێك لە ئایەتێك..

أَخْبَرَنَا يَعْلَى ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْمَلِكِ ، عَنْ عَطَاءٍ : فِي الْمَرْأَةِ الْحَائِضِ : تَقْرَأُ؟
قَالَ : لَا ، إِلَّا طَرَفَ الْآيَةِ.
سنن الدارمي | ١٠٢٢

حَدَّثَنَا يَعْلَى ، حَدَّثَنَا عَبْدُالْمَلِكِ ، عَنْ عَطَاءٍ فِي الْمَرْأَةِ الْحَائِضِ : أَتَقْرَأُ ؟ قَالَ : لَا ، إِلَّا طَرَفَ الْآيَةِ ، وَلَكِنْ تَوَضَّأُ عِنْدَ وَقْتِ كُلِّ صَلَاةٍ ، ثُمَّ تَسْتَقْبِلُ الْقِبْلَةَ ، وَتُسَبِّحُ وَتُكَبِّرُ وَتَدْعُو اللَّهَ.

[ سنن الدارمي ( ٩٩٧ )]

* شەرعەن جائز نییە ئینسان بە بێ دەست نوێژ دەست بدات لە موصحەف و تیایدا قورئان بخوێنێ، کاتێك ئەمە دەست لێدانی موصحەف دروست نەبێ، ئەوە جائز نەبوونی قورئان خوێندنی ئینسانی لەش گران و ئافرەتی حائض ـە ئەولاترە.

إبن عبدالبر دەڵێت : فوقەهای شارەکانی وەك (مەدینە و عێراق و شام) هیچ خیلافێك نییە لە نێوانیان کە موصحەف نابێ دەستی لێبدرێ ئیللا بە دەست نوێژەوە نەبێ. ئەمە قەولی (مالك و شافعی و أبي حنيفة و الثوري و الأوزاعي و أحمد کوڕی حنبل و إسحاق کوڕی راهويه و أبي ثور و أبي عبيد ـە]، ئەمانە ئیمامەکانی فقه و حدیثن لە سەردەمی خۆیان، وە هەمان شتیش ڕیوایەت کراوە لە سعد کوڕی أبي وقاص و عبدالله کوڕی عمر، طاوس و حسن البصري، عامر الشعبي و قاسم کوڕی محمد و عطاء. وە إسحاق کوڕی راهوية دەڵێت : هیچ کەسێك بۆی نییە لە موصحەفدا قورئان بخوێنێ بە بێ دەست نوێژ، ئەمە لەبەر قەولی الله ﷻ : ﴿ لَّا يَمَسُّهُ إِلَّا الْمُطَهَّرُونَ ﴾. نییە، بەڵکو لەبەر قەولی ڕەسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ : « لَا يَمَسَّ الْقُرآنَ إِلَّا طَاهِرُ ».

وە ئەمەش بە مەزهەبی مالك دەچێ قەولەکەی دەلیلە لەسەری کە لە موطأ ـەکەیدا هاتووە، وە شافعی و الأوزاعی و أبو ثور و أحمد دەڵێن : ئینسانی لەش گران نابێ دەست بدات لە موصحەف، بە هەمان شێوەش ئافرەتی حائض ـە، هەروەها کەسی بێ دەست نوێژیش نابێ دەستی لێبدات.
تەنانەت کۆمەڵێك لە تابعین بە کەراهەتیان داناوە بە بێ دەست نوێژ دەست بدرێ لە درهەم کە زیکری الله ـی تێدا نوسراوە لەوانە : قاسم کوڕی محمد و عامر الشعبي و عطاء، گومانی تێدا نییە دەست دان لە موصحەف بێ دەست نوێژ کەراهەتەکەی قورسترە.

ولم يختلف فقهاء الأمصار بالمدينة ، والعراق ، والشام ، أن المصحف لا يَمسُّه إلا طاهر على وضوء. وهو قول مالك ، والشافعي ، وأبي حنيفة ، والثوري ، والأوزاعي ، وأحمد بن حنبل ، وإسحاق بن راهوية ، وأبي ثور ، وأبي عبيد ، وهؤلاء أئمة الفقه والحديث في أعصارهم ، ورُوي ذالك عن سعد بن أبي وقاصٍ ، وعبدالله بن عمر ، وطاوسٍ ، والحسن ، والشعبيِّ ، والقاسم بن محمدٍ ، وعطاءٍ. قال إسحاق بن راهوية : لا يَقرأُ أحد في المصحف إلا وهو متوضئ ، وليس ذالك لقول الله عَزَّ وَجَل : ﴿ لَّا يَمَسُّهُ إِلَّا الْمُطَهَّرُونَ ﴾. ولكن لقول رسول الله ﷺ : « لَا يَمَسَّ الْقُرآنَ إِلَّا طَاهِرُ ».
قال أبو عمر : وهذا يُشبه مذهب مالك على ما دل عليه قوله في موطئه ، وقال الشافعي ، والأوزاعي ، وأبو ثور ، وأحمد : لا يَمَسُّ المصحفَ الجُنبُ ، ولا الحائضُ ، ولا غير المتوضئ.

وقال أبو عمر : وقد كره جماعة من التابعين ، منهم القاسم بن محمدٍ ، والشعبيُّ ، وعطاءُ ، مَسَّ الدراهم التي فيها ذكر الله على غير وضوء ، فهو لا شَكَّ أشَدُّ كراهية أن يَمَسَّ المصحف غير متوضِّئ.

[ تحفة الأبرار في الجمع بين التمهيد والإستذكار **(٣/٨١٤)**]

عبدالله کوڕی سلمة دەڵێت : من و دوو پیاو کە یەکیان لە هۆزی ئێمە بوو، ئەویتریان پێم وایە لە هۆزی بني أسد بوو چووینە لای علي کوڕی أبی طالب، وە ئەو دەیناردن بۆ شوێنێك پێی ووتن : ئێوە دوو کەسی توندن هەوڵبدەن توند بن لە دینەکەتاندا، پاشان هەستا چوویە تەوالێت، پاشان هاتەوە داوای ئاوی کرد، ئەنجا مشتێکی لێهەڵگرت و مەسحی کرد، پاشان دەستی کرد بە قورئان خوێندن، ئەوانەی لەوێ بوون ئینکاری ئەمەیان لێکرد، ئەویش ووتی : ڕەسول الله ـ صلی الله علیه وسلم ـ لە تەوالێت دەهاتە دەرەوە قورئانی بۆ دەخوێندین، وە لەگەڵمان گۆشتی دەخوارد، هیچ شتێك نەبوو ڕێگر بێ لە خوێندنی قورئانی ئیللا لەش گرانی نەبێ.

عَنْ عَبْدِاللَّهِ بْنِ سَلِمَةَ ، قَالَ : دَخَلْتُ عَلَى عَلِيٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَا وَرَجُلَانِ ، رَجُلٌ مِنَّا وَرَجُلٌ مِنْ بَنِي أَسَدٍ أَحْسَبُ. فَبَعَثَهُمَا عَلِيٌّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ وَجْهًا ، وَقَالَ : إِنَّكُمَا عِلْجَانِ ، فَعَالِجَا عَنْ دِينِكُمَا. ثُمَّ قَامَ فَدَخَلَ الْمَخْرَجَ ، ثُمَّ خَرَجَ فَدَعَا بِمَاءٍ ، فَأَخَذَ مِنْهُ حَفْنَةً فَتَمَسَّحَ بِهَا ، ثُمَّ جَعَلَ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ ، فَأَنْكَرُوا ذَلِكَ ، فَقَالَ : إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يَخْرُجُ مِنَ الْخَلَاءِ فَيُقْرِئُنَا الْقُرْآنَ ، وَيَأْكُلُ مَعَنَا اللَّحْمَ ، وَلَمْ يَكُنْ يَحْجُبُهُ _أَوْ قَالَ : يَحْجُزُهُ_ عَنِ الْقُرْآنِ شَيْءٌ لَيْسَ الْجَنَابَةَ.
سنن أبي داود | ٢٢٩ سنن الترمذي | ١٤٦ سنن النسائي | ٢٦٥ سنن ابن ماجه | ٥٩٤ مسند أحمد | ٨٤٠ سن الدارقطني باب في النهي للجنب والحائض عن قراءة القرآن | ١١

هەروەها لە عبدالله کوڕی رواحة و عبدالله کوڕی عباس ـ رضي الله عنهما ـ هاتووە دەڵێن : ڕەسول الله ـ صلی الله علیه وسلم ـ نەهی کرد لێمان لەش گران بین قورئان بخوێنین.

حدثنا محمد بن مخلد ، حدثنا الهيثم بن خلف ، حدثنا ابن عمار الموصلي ، حدثنا عمر بن رزيق ، عن زمعة بن صالح ، عن سلمة بن وهرام ، عن عكرمة ، عن ابن عباس رضي الله عنهما ، قال : دخل عبدالله بن رواحة فذكر نحوه ، وقال : إن رسول الله ﷺ نهى أن يقرأ أحدنا القرآن وهو جنب.

[ سنن الدارقطني باب في النهي للجنب والحائض عن قراءة القرآن ( ١٤ )]

إسحاق کوڕی منصور الکوسج دەڵێت : پرسیارم کرد لە أحمد کوڕی حنبل ئینسانی لەش گران قورئان دەخوێنێ؟
ووتی : بەشێکی ئایەتێك، هەروەها تەسبیحات بکات، ئەمما بە عەمدی دەست بکات بە خوێندنی سورەتێك ئەوە بەلامەوە باش نییە.

قلت : يقرأ الجُنُب مِنَ القُرآن؟ قال : طرف الآية "والشيء" كذالك والتسبيح فَأمَّا أن يتعمد والسورة فما يعجبني.

[مسائل أحمد بن حنبل وإسحاق ابن راهوية رواية الكوسج ( ٦٣ )]

إبن هانئ دەڵێت : پرسیارم کرد لێی ئایا کەسی لەش گران دەتوانێ بسم الرحمن الرحيم بخوێنێ؟ ووتی : با تەواوی نەکات، چونکە ئایەتێکە لە کتابی الله ﷻ.

سألته عن الجُنُب يَقرَأ : بسم الله الرحمن الرحيم؟ قال : لا يتمها ، هي آية مِن كتاب الله عَزَّ وَجَلَ.

[ مسائل الإمام أحمد بن حنبل رواية إبن هانئ (١٢٤)]

إسماعيل کوڕی سعيد الشالنجي دەڵێت : ئینسانی لەش گران و ئافرەتی حائض ـە بۆیان نییە قورئان بخوێنن. وە حاڵی حائض ـە زۆر قورسترە.

وعنه : لا يَقرَآنِ. وهي أشَدُّ.

[ مسائل الإمام أحمد بن حنبل رواية الشالنجي | صـ : (١٠٧)]

هەتا ئیمامی أحمد پێی باش نەبووە لەشگ گران بانگ بدات چ بگات بەوەی لەگەڵ حائض ـە قورئان بخوێنن.

قلت : الجُنُب يُؤَذِّن؟ قال : لا.

[مسائل الإمام أحمد بن حنبل رواية صالح بن أحمد ( ٨٣)]

*هەروەها سەلەف ڕێیان نەداوە ئافرەتی حائض ـە سوجدەی تیلاوە ببات کاتێك گوێی لێی دەبێ، ئەمە قەولی هەریەك لە : عبدالله کوڕی عباس ـە ـ رضی الله عنهما ـ لەگەڵ أبي قلابة و إبراهيم النخعي و أبي الضحی و الحسن البصري ـيە.

أَخْبَرَنَا عَمْرُو بْنُ عَوْنٍ ، عَنْ خَالِدِ بْنِ عَبْدِاللَّه ، عَنْ خَالِدٍ الْحَذَّاءِ ، عَنْ أَبِي قِلَابَةَ قَالَ : لَا تَسْجُدُ الْمَرْأَةُ الْحَائِضُ إِذَا سَمِعَتِ السَّجْدَةَ.

[سنن الدارمي ( ١٠٠٦)]

أَخْبَرَنَا عَمْرُو بْنُ عَوْنٍ ، عَنْ خَالِدٍ ، عَنِ الْحَسَنِ بْنِ عُبَيْدِاللَّه ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ ، أَنَّهُ كَانَ يَكْرَهُ لِلْحَائِضِ أَنْ تَسْجُدَ إِذَا سَمِعَتِ السَّجْدَةَ.

[ سنن الدارمي (١٠٠٧)]

أَخْبَرَنَا أَحْمَدُ بْنُ حُمَيْدٍ ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحِيمِ بْنُ سُلَيْمَانَ ، حَدَّثَنَا الْحَسَنُ بْنُ عُبَيْدِاللَّه ، عَنْ مُسْلِمِ بْنِ صُبَيْحٍ ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا ، أَنَّهُ سُئِلَ عَنِ الْحَائِضِ تَسْمَعُ السَّجْدَةَ ، قَالَ : لَا تَسْجُدُ لِأَنَّهَا صَلَاةٌ.

[ سنن الدارمي (١٠٢٤)]

أَخْبَرَنَا أَحْمَدُ بْنُ حُمَيْدٍ ، حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ غِيَاثٍ ، عَنِ الْحَسَنِ بْنِ عُبَيْدِاللَّه ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ وَأَبِي الضُّحَى ، قَالَا : لَا تَسْجُدُ.

[سنن الدارمي (١٠٢٥)]

أَخْبَرَنَا أَحْمَدُ بْنُ حُمَيْدٍ ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ ، عَنْ أَشْعَثَ ، عَنِ الْحَسَنِ قَالَ : لَا تَسْجُدُ.

[ سنن الدارمي (١٠٢٨)]

* لەوانەیە هەبێ بڵێت : ئەی باشە دەکرێ ئافرەت لەو هەموو ماوەیەی حیض ـیدا واز لە قورئان خوێندن بێنێ و نەخوێنێ، هەیە حفظ دەکات، هەیە دەرسی تەلەبە دەڵێتەوە؟

لە وەڵامدا دەڵێم : بەڵێ بۆ نابێ، ئەمە شەرعە مەجالی عاطفە و عەقڵی تێدا نییە صەحابە و سەلەف سەد قاتی ئێمە لە خەمی دین و قورئان خوێندندا بوون، بەڵام لەو کاتەدا وازیان لە قورئان خوێندن هێناوە دەی تۆش دەبێ شوێن ئەوان بکەوی.

ئینسانی لەش گران و ئافرەتی حائض ـە ئەگەر بۆیان هەبووایە قورئان بخوێنن ، ئەوە چ شتێك دەبوو لە ڕێگریان لەوەی نوێژ بکەن؟!

مُعاذة کچی عبدالله خێزانی صِلة إبن أَشيَم دەڵێت : ئافرەتێك پرسیاری کرد لە عائشە : هەریەکێك لە ئێمە نوێژەکانی کاتی حیض قەزا بکاتەوە؟

دایکه عائشه ـ رضي الله عنها ـ ووتی : تۆ خەوارجی حەروری؟!
هەریەکێك لە ئێمە لە سەردەمی ڕەسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ دەکەوتینە حیض ـەوە ئەمرمان پێنەدەکرا قەزای نوێژەکانمان بکەینەوە.

...عَنْ مُعَاذَةَ أَنَّ امْرَأَةً سَأَلَتْ عَائِشَةَ فَقَالَتْ : أَتَقْضِي إِحْدَانَا الصَّلَاةَ أَيَّامَ مَحِيضِهَا؟ فَقَالَتْ عَائِشَةُ : أَحَرُورِيَّةٌ أَنْتِ؟! قَدْ كَانَتْ إِحْدَانَا تَحِيضُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ ثُمَّ لَا تُؤْمَرُ بِقَضَاءٍ.

[صحيح البخاري ( ٣٢١)، صحيح مسلم (٧٦١) مسند أحمد (٢٤٠٣٦) سنن الترمذي (١٣٠)سنن الدارمي (١٠٠٣)]

// 🕮جا من سەرم سوڕ دەمێنێ لە کەسانێك تۆ دێی دەڵێی : جمهوری صەحابە و تابعین و ئەتباعی تابعین لەسەر ئەوەن کە ئافرەتی حائض ـە و لەش گران بۆیان نییە بە هیچ شێوەیەك قورئان بخوێنن، بەڵام ئەوان دێن دەڵێن : دەی فلانە مەلا و فلانە بانگخواز دەڵێن جائزە و کێشەی نییە! واز لە صەحابە ـ رضوان الله علیهم ـ بهێنین بۆ کەسانی ئەم سەردەمە!
یاخود دێن دەڵێن ئەم حدیثە سەنەدەکەی مەقالی لەسەرە نابێتە حوجە، ئەی باشە یانی ئەو عیللەیە لەم ئیمامانە [سفیان الثوري و عبدالله کوڕی مبارك و شافعي و أحمد کوڕی حنبل و إسحاق بن راهوية و الترمذي] و غەیری ئەوانیش کە عەمەلیان بەم حدیثە کردووە شاراوە بووە، بەڵام خەڵکی ئەم سەردەمە بەمەیان زانیوە و نابێ کاری پێبکرێ!!
کاتێك ئەم قسانەیان دەبیستی ئەنجا بۆت دەردەکەوێ کە ئیدیعا کردنیان بۆ مەنهەجی سەلەف تەنها قسەیە، ئەمما شوێن مەنهەج و مەزهەبی سەلەف بکەون نەخێر، تەنها لەوەدا شوێنیان دەکەون کە لەگەڵ هەوا و ئارەزوویاندا دەگونجێ.

## دەروازەیی بـــیست و هـــەشت

### | ئافرەتێك مێردەكەیی بمرێت بەڵام حملی هەبێت، ئایا دەتوانێت زەواجبكاتەوە؟ |

لە ئەصل ـدا : عیددەی ئافرەتێك کەمێردی بمرێت چوار مانگ و دەڕۆژە بەهەموو پێوەرێکی قورئان و سوننەت.

بەڵام إستثناء :
<u>حدیث ـێکمان هەیە ئیمامی الترمذي ڕیوایەتی کردووە</u>، لە أبو السنابل بن بعكك بن الحارث وە دەفەرموێت : (سبيعة الأسلمية) دوای وەفاتی مێردەکەیی بەماوەی بیست و سێ یان بیست و پێنج ڕۆژ سکەکەی دانا بۆیە خۆی ڕازاندەوە بۆ زەواج بەڵام ووتیان نابێت وەبۆت نیە(واتە زەواج بکات)، ئەو باسە بەپێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ گەیشت فەرموویی : ئەگەر بتەوێ ئەوا ماوەکەت تەواوبوە.

حدیث ـێکی تر هەیە : سلمان بن یسار دەڵێت : أبو هريرة و ابن عباس و عبدالرحمن بن سلمە باسی ئافرەتی مێرد مردوویان کرد کەوا حملی هەبێت و لەکاتی وەفاتی سکەکەیی دابنێت،
عبدالله بن عباس دەڵێت : عیددەکان تەواو دەکات واتە مردن و دانانی سك، بەڵام أبو سلمە ووتی : بەڵکو لەکاتی سکەکەی ماوەیی کۆتایی دێت.
أبوهرة دەڵێت : من لەگەڵ قەولی کوڕیی برام أبو سلمەم، دواتر هەواڵ دەنێرن بۆ أُم سلمە ـی خێزانی پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ ئەویش دەڵێت : سبیعەی أسلمی سکی دانا پاش وەفاتی مێردی چونە لای رسول الله ـ صلی الله علیه وسلم ـ و پرسیاریان لێکرد ئەویش ڕێگەییدا زەواج بکات.

<u>ئیمامی الترمذي دەڵێت :</u> کارکردن بەو باسە لای زۆربەی اهلی علمە لە هاوەڵان و غەیری ئەوانیش، بەوەی ئافرەتی حاملەی مێرد مردوو کاتی سکی دانا ماوەی تەواو دەبێتت و ئەگەر بێت و عیدەی تەواو نەکردبێت، ئەوەش قەولی هەریەك لە (سفیان الثوری، أحمد، شافعی، إسحاق)ـە.

<u>وە ابن شهاب الزهری دەڵێت :</u> دەکرێت تەنانەت لەکاتێکدا بێت زەواجبکات کەوا لە نفاس واتە پاك بوونەوەی دووای منداڵ بوونیش تەواو نەبووبێت بەو مەرجەیی نابێت لێی نزیك بێتەوە هەتا پاك دەبێتەوە.

[سنن الترمذی، کتاب الطلاق(١١٩٣)، النسائی(٣٥٠٨)، إبن ماجە(٢٠٢٧)، الدارمی(٢٣٢٧٠)، مسند إمام أحمد.
[بخاری(٥٣١٨/٤٩٠٩)، مسلم(١٤٨٥)، النسائی(٣٥١٢,٣٥١٣,٣٥١٤,٣٥١٥,٣٥١٦,٣٥١٠)، موطأ إمام المالك(١٧٢٥)].

## | زانایان جیاوازن لە تەڵاقی کەسێك کە دەڵێت : بە خێزانەکەیی تۆ تەڵاق دراویت ان شاء الله(واتە استثناءی تێبکات) |

ئیمامی أحمد و سوفیان دەڵێن : هیچ ناڵێین لەم باسەدا.

ئیمام إسحاق دەڵێت : تەڵاقی ناکەوێت، چونکە بەوتنی استثناء واتە نیەتی وایە تەڵاقی نەدات.

ئیمام مالك و شوێنکەوتەیی ڕای ئەو لە عێراق وەك ابن أبی لیلی، وە اهلی شام وەك ئیمام ئەوزاعی دەڵێن : تەڵاقی دەکەوێت و استثناکەیی بێسوودە (چونکە ئەوان وایی دەبینن تەڵاق کارێکە لە کارەکان بەڵام استثناء لە سوێندایە).

ئیمام أحمد دەڵێت : تەڵاق سوێندی نیە

ئەوانەشی استثناء واتە ان شاء الله لە تەڵاق بە جائیز دەزانن و تەڵاقەکە ناکەوێت گەر ووتی، ئەوانیش ئیمام (إبراهیم ـی نخعی و طاوس ـە و لە ڕیوایەتێکیش سفیان ـی ثوری)ـیش.

ئیمام إسحاق ـیش دەڵێت : وایی دەبینین ئەمە باشترین مەزهەبە، واتە ئەوانەیی پێیان وایە ووتی ان شاء الله تەڵاقەکەی ناکەوێت.

## | دەرچونی (دەرکردنی) ئافرەتی تەڵاقدراو لەماڵەکەی خۆی |

فاطمە ـ ی کچی قەیسی کچی خالد ـ ی قورەشی خێزانی عەمری کوڕی حەفص بوو تەڵاقی تەواوەتی داو جیابونەوە، عەمر هەندێك شتی بۆنارد، بەڵام فاطمە ڕشتی.
ئەویش پێی ووت : واللە تۆ هیچ شتێکت نیە لەسەر ئێمە.
فاطمە هاتە لای رسول اللە ـ صلی اللە علیە وسلم ـ و بابەتەکەی بۆی باسکرد
فەرمووی : عەمر هیچی تۆی لە ئەستۆ نیەواتە لە (نەفەقە و ماڵ)

[اخرجە مسلم (١١٤٤)]

جا ئیمامی أحمد ئەم فەرمودە دەکاتە بەڵگە لەسەر ئەوەی ئافرەتی تەڵاقدراو کە هەر سێ تەڵاقەکەی کەوتبێت دەتوانێت دەرچێت لە ماڵەکەی وە جێگا و نەفەقەی بۆ نیە.

بەڵام گەر ئافرەتەکە حامیلە بوو حاڵەتەکە جیاوازە دەبێ نەفەقە و ماڵی پێبدەی تا سکەکەی دادەنێت (مەرج نیە خانوی بۆبگری بەڵکوو لەسەر توانای خۆت کەوتوە، ژورێکیشی بۆدانێی لەماڵەکەت دەبێت)

اللە سبحانە دەفەرموێت : {وَإِن كُنَّ أُوْلَـٰتِ حَمْلٍ فَأَنفِقُواْ عَلَيْهِنَّ حَتَّىٰ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّۚ}

* وە ئەوانەی وای بۆ دەچن نەفەقەی بۆ نیە ئافرەتی تەڵاقدراو کە حامیلە نەبێت بریتین لە : (ابن عباس و عطاء و شەعبی و حەسەن و احمد و شافعی).
جیاوازی هەیە لەم باسەش (ابن مسعود و نەخەعی و ثەوری و ئەهلی ڕەئیش بۆچونیان جیایە).

[ المغني لابن قدامة، مسائل الكوسج
الإنصاف، الأوسط، سنن الترمذي، الاستيعاب]

**| ژن و پیاوێك زەواجیان كردووە ئافرەتێك بڵێت شیرم پێتان داوە (واتە براو خوشكی شیرین) تەڵاق دەدرێ یان دەمێنێتەوە؟ |**

إیمام الترمذی هێناویەتی بە ژمارە (١١٥١) لە عقبة بن الحارث ـ رضي الله عنه ـ دەڵێت : ئافرەتێكم خواست دواتر ئافرەتێكی ڕەش پێست هات و ووتی : من شیرم بەئێوە داوە.
منیش چومە لای رسول الله ـ صلى الله علیه وسلم ـ و پێم ووت : من كچی فڵان و فلانم خواستوە ئافرەتێكی ڕەش پێست هاتوو ووتی من شیرم بە ئێوە داوە، بەڵام ئەو درۆ دەكات،
دەڵێت : رسول الله ـ صلى الله علیه وسلم ـ ڕووی لێ وەرگێڕام،
دواتر چوومەڕووەكەی تری پێم ووت : ئەو درۆ دەكات،
رسول الله ـ صلى الله علیه وسلم ـ فەرمووی : چۆن دەبێت لەكاتێكدا ئەو دەڵێت من شیرم بەئێوەداوە لێی جیابەوە یان وازی لێبێنە.

ئیمام الترمذی لە سنن دەڵێت : كار كردن بەوە لای كۆمەڵێك لە هاوەڵانی رسول الله ـ صلى الله علیه وسلم ـ و غیری ئەوانیش ڕێگەیان داوە بەشەهادەی یەك ئافرەت لە شیرپێدان (والله اعلم واتە یەك ئافرەت شاهیدی بدات بە شیرپێدانیان وەردەگیرێت).

وە ابن عباس دەڵێت : دەكرێ و ڕێگە پێدراوە شهادەی یەك ئافرەت بۆ شیرپێدان وە سوێندیشی لێ وەر دەگیرێت .

ئەوەشیان هەریەك لە ئیمامی (أحمد و إسحاق) لێیان وەرگرتووە.

وه هەندێك له اهلی علم دەڵین : شهادەی ئافرەتێك بەتەنها قبوڵ ناكرێ، بەڵكو دەبێت زیاتربێت، لەوانەش ئیمامی (شافعی)

وه أبو عبید دەڵێت : پێویسته لەسەر پیاوەكه جیابێتەوه و وازی لێبێنێت نابێت حاكم حوكم بدات.

وه ئیمام مالك دەڵێت : شهاده قەبوڵ ناكرێت له شیرپێدان حەتا دوو ئافرەت نەبێت.

[بخاری (٨٨،٢٠٥٢,٢٦٤٠)، ابي داود (٣٦٠٣)، النسائی (٣٣٣٠)، الدارمی(٢٣٠١)، مسند أحمد بن حنبل، جامع الصحیح للترمذی، حدیث (١١٥١)]

## دەروازەیی بـــیست و نوو

### | ئایا مەسح کردنی سەر لەکاتی دەست نوێژ لەسەر خیمار دەبێت بۆ ئافرەت؟ |

خیمار واتە : نیقاب، ئافرەت چۆن مەسح دەکات؟

مەسحکردنی سەر بۆ پیاوان و ئافرەتان یەکسانن.

٢٤٢ - سعيد بن المسيب دەڵێت : پیاو ئافرەت لە مەسح ـی سەر یەکسانن.

٢٤٣ - نافع دەڵێت : صفية بنت أبي عبيد ـﻢ بینی دەست نوێژی دەگرت، دەستەکانی بردە ژێر خیمارەکەیەوە نێوچاوانی(پێشەوەی سەری) مەسح کرد.

٢٤٤ - عبد الرحمن بن أبي ليلى دەڵێت : ئافرەت دەستەکانی دەباتە ژێر خیمارەکەیەوە وە پێشەوەی سەری مەسح دەکات.

٢٤٥ - عكرمة دەڵێت : مەسحی نێوچاوانی دەکات(مەبەستت پێشەوەی سەرە).

٢٤٧ - عطاء دەڵێت : ئافرەت ئەگەر وویستی سەری مەسح بکات بۆ دەست نوێژ، وە دەستی بردە ژێر خیمارەکەیەوە پێشەوەی سەری مەسح کرد، دەست نوێژی بۆ تەواو دەکات.

٢٥٠ - الحسن البصري لە دایکیەوە ئەویش لە أم سلمة کە : مەسحی سەری خیماری کردووە بێ ئەوەی دایکەنێ(لایبەرێ).

٢٥٢ - إبراهيم دەڵێت : ئەگەر ئافرەت دەست نوێژی گرتت خیمارەکەی دادەنێت وە مەسحی سەری دەکات.

٢٥٣ - الحسن دەڵێت : ئافرەت مەسحی پێشەوەی سەری و لەسەر خیماریش دەکات.

٢٥٤ - حماد دەڵێت : ئافرەت خیمارەکەی دادەکەنێت لە هەموو دەست نوێژگرتنێکدا.

[مصنف ابن أبي شيبة].

---

// ئەفزەڵ ئەوەیە نیقاب دانێت بۆ مەسح کردنی سەرت بەڵام لەسەر نیقابیشەوە بکرێت کێشەنیە ان شاء الله، بەڵام بزانێت توشی فیتنە دەبێت ئەوە لای نەباتت.

## | ئایا ئافرەت قاچەکانی بەدیارەخات لە نوێژدا؟ |

ئیمام مالك ریوایەتی کردوە وە لە ڕێگەی عبد الرزاق لە مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ، لە دایکیەوە، پرسیاری کرد لە أُمّ سَلَمَةَ لەوەی لەچەند پۆشاك ئافرەت نوێژەکات؟
فەرمووی : لە خیمار(سەر و مل و سینگی دادەپۆشێت) و ئەو پۆشاکە ئەستورەی قاچەکانی دادەپۆشێت
وە ریوایەتیان کردوە أبو داود وابن المنذر وغيرهم وە صحيح موقوفه.

[الموطأ (٤٧٣)]

ئیمام مالك دەڵێت : کاتێ ئافرەت نوێژی کرد قژی یان سینگی یان پشتی یان قاچی دیاربوو نوێژەکەی دەگێڕێتەوە مادەم لە کاتی نوێژە.

[مدونة ابن القاسم]

ابن هانئ دەڵێت : پرسیارم کرد دەربارەی ئافرەتێك لە چەند پۆشاك نوێژەکات؟
ووتی : کەمترینی پۆشاکێکی سەرتاسەری (قەمیص) و خیمارێکە وە قاچەکانی دا دەپۆشێت دەبێت پۆشاکەکە درێژ بێت و قاچی داپۆشێت.

[مسائل أحمد (٢٨٦)]

ابن منذر دەڵێت : زانایان بە واجبی دەزانن ئافرەت هەموو شوێنێکی داپۆشێ لە نوێژدا جگە لە دەست و ڕوخساری نەبێت.

[اجماع]

الحمدلله كه الله تعالى دەرفەتیی پێدامم ئەم ناميلكەيەم تەواوو كرد، بابەتانێك بوون بەپێوویستم زانی كه ئەم بابەتانە كۆبكرێنەوە و لە ناميلكەيەك دابنرێن تا ئاسانبێتت لەبەردەستت، الله تعالى بێ سنور پاداشتی ئەو خوشكە خۆشەویستەمم بداتەوە كە كردیە پیدی ئێف و ئەو خوشكە خۆشەویستەمم كە دیزاینی بەرگەكەیی بۆ دانایىن، وە مامۆستای خۆشەویستمم الله تعالى خۆشی بووێن و بیكاتە تێشووی قیامەتانن امین

تم الحمدلله ...

وصل الله على سيدنا محمد وعلى آله وأصحابه ومن تبعهم بإحسان إلى يوم الدين.

https://t.me/sunat_sunat